


**ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە**

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: هەژار مەجید

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: سیروان مەحموود

ناوەندی ڕۆشنبیری و هونەریی ئەندێشە - ناوەندی بڵاوکردنەوەی ئەندێشە

سلێمانی - شەقامی مەولەوی - تەلاری بازرگانیی سیروانی نوێ - نهۆمی چوارەم

http://www.endeshe.net

andesha.library@yahoo.com ● andesha@outlook.com

http://www.facebook.com/Andeshalib

07501026400

**زنجیرەکتێبی فیکر و ئەدەب**

**سەرپەرشتیاری زنجیرە**

**سیروان مەحمود**

ناوی کتێب: لێکۆڵینەوەیەک لە سۆسیۆلۆژیای ئیسلام

ناوی نووسەر: دکتۆر عەلی وەردی

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: دانا مەلا حەسەن

پێداچوونەوەی: دکتۆر ئەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

بابەت: کۆمەڵناسیی ئایین

دیزاینی بەرگ: باسم ڕەسام

دیزاینی تێکست: دانا حەسەن

نۆبەتی چاپ: یەکەم ٢٠١٦

چاپخانە: ئەندێشە

تیراژ: (٢٠٠٠) دانە

نرخ: (٦٠٠٠) دینار

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان

ژمارە (١٥٣٦)ی ساڵی (٢٠١٦)ی پێ دراوە.

## پێرست

## دەستپێک

لە دوورەوە دکتۆر عەلی حسەین وەردی زانام دەناسی، لە تەمەنێکدا بووم، لە دە ساڵان تێپەڕم نەدەکرد، ئەویش لەڕێی ئەو گفتوگۆ تەلەڤزیۆنییانەوە، کە لەنێوان کەسانێکی بەتەمەن لە خۆم گەورەتردا ساز دەکران، لەمیانەی قسەکانیاندا، ناوی کۆچکردوو عەلی وەردی دەهێنرا؛ ناوێک، جێی مشتومڕ. پاشان حەزی ئەوەم لا دروست بوو، ئاشنای نووسینەکانی خۆی و ئەو نووسینانەشی ئەوانی دیکە لەسەر ئەو دەیاننووسن، ببم. لە ڕێی نووسینەکانیەوە، زیاتر و زیاتر ئاشنای بووم، ئەوەشم بۆ دەر کەوت، لە گۆڤاری مامۆستا "*المعلم*"یشدا وتاری کۆمەڵایەتیی گرنگ دەنووسێت. لە تەمەنێکی کەمیشدا، بووم بە خاوەنی یەکەمین کتێبی وەردی، بەناوی *لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی*، یەکەمین جاریش کە ئەو کتێبەم خوێندەوە، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر دانام دەربارەی جۆری خوێندنەوەی تایبەتیی خۆم، لە هەمان کاتیشدا، چاوی بەرامبەر چەندین شت کردمەوە و وای کرد هۆشیان پێ بدەم. کۆچکردوو

عەلی وەردی، زۆرینەی کتێبەکانی لە سەردەمی پادشایەتی و هەندێکیشیانی لە سەردەمی کۆماریدا بڵاو کردنەوە. *چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق* دوایین کتێبی بوو لە ماوەی ژیانیدا بە چاپی گەیاند.
کۆچکردوو وەردی، بەردەوام بوو لە چاپکردنی زنجیرە کتێبی *چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق*. لە راستیدا، ئەم زنجیرەتوێژینەوە مێژووییە لە رووی جوگرافییەوە تەنها عێراق ناگرنەوە، بەڵکوو تەواوی ئەو ناوچانەش لەخۆ دەگرن، کە دەوری عێراقیان داوە، وەک: تورکیا، ئێران، میسر، سووریا و دوورگەی عەرەبی. وەردی هەر لە یەکەم لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتییە مێژووییەکەیەوە، پێی وا بووە بێ لێکۆڵینەوە لەو ناوچانەی دەوری عێراقیان داوە و کاریگەرییە قووڵەکانیان لەسەری، ناتوانین لە مێژووی نوێی عێراق تێبگەین.

وەردی بەردەوام بوو لە چاپکردنی بەرگەکانی دیکەی کتێبی ناوبراو، تا لە ساڵی ۱۹۷۹دا بەرگی شەشەمی بە چاپ گەیاند، پاشان لە چاپکردنی بەرگەکانی دیکە وەستا. خەڵکی دەربارەی هۆکاری وەستان یان تەواونەکردنی بەرگەکانی دیکە پرسیاریان لێ دەکرد، بەتایبەت گەیشتبووە قۆناغێکی مێژوویی زۆر گرنگ، ئەویش ساڵی ١٩٢٤ بوو، کە قۆناغی یەکەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقی نوێیە، ئەو سەردەمەی وەردی تیایدا ژیا.

پەستێنك

## بڵاوبوونەوەی کتێبەکانی وەردی لە دەرەوەی عێراق

کاتێک ساڵی ١٩٨٠، جەنگی ویرانکەری عێراق-ئێران هەڵگیرسا، چەندین کێشە و نەهامەتیی لەگەڵ خۆیدا بۆ عێراق هێنا، کۆچم بۆ دەرەوەی عێراق کرد، لە ساڵی ١٩٩٠دا، بڕیارم دا خانەیەکی چاپکردنی عەرەبی/ ئینگلیزی لە لەندەن دابمەزرێنم، تا لە کەشێکی ئازاد و دوور لە چاودێری و ترس و تۆقاندنی هزری، کتێبە هزری و مێژووییەکان چاپ بکەین، کتێبەکانی کۆچکردوو وەردیم خستە پێشەوەی ئەو کتێبانەی چاوم لەسەریان بوو لە دەرەوەی عێراق چاپیان بکەم، بە هۆی گرنگی و بایەخیانەوە لە جووڵاندنی هزردا، هەروەها واش لە مرۆڤ دەکەن، لە ڕوانگەیەکی نوێوە بیر بکاتەوە.

لەبەر ئەوە، داوام لە کۆچکردوو، دکتۆر وەردی کرد مافی لەچاپدانی کتێبەکانیم پێ بدات، ئەویش سەرەڕای ئەوەی بەوە ناسرابوو مافی چاپکردنی کتێبەکانی بە هەر خانەیەکی دیکە ڕەت دەکاتەوە، وەلێ بە داواکەم ڕازی بوو، کاتێکیش ساڵی ١٩٩١ نەخۆشییەکەی سەخت بوو، گرێبەستەکەمان هەموار کردەوە و مافی چاپکردنی تەواوی کتێبەکانی و دەستنووسەکانی خۆی بەتەنها بە من بەخشی، کاتێکیش کتێبی *چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق*مان چاپ کرد، پرۆسەی دزین و ساختەکردنی کتێبەکانی کۆچکردوو لەلایەن چەند ساختەکارێکی ئێرانی و پاشانیش لوبنانی سەری هەڵدا. بە هۆی نەبوونی یاسای

پاراستنی مافی نووسەر و چاپکارەوە لە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا، کتێبە ساختەکان کاریگەرییەکی گەورەیان کردە سەر فرۆشی کتێبەکانی وەردی، کە لەلایەن ئێمەوە چاپ کرابوون، بە هۆی جیاوازیی نرخی ئێمە و نرخی کتێبە ساختەکانەوە.

**بەردەوامبوون لە چاپکردنی کتێبەکانی وەردی**

ئەو گرێبەستەی لەنێوان من و کۆچکردوودا هەبوو، پابەندییەکی ئەخلاقیی گەورە بوو، بەرپرسیاریتیی پاراستنی مافی وەردی و مافی میراتگرەکانی خستە ئەستۆم، بەتایبەت کاتێک چەندین چاپی شێوێنراو خرانە کتێبفرۆشییەکانەوە، کە ناوی ئەویان هەڵگرتبوو!

لەم چەند ساڵەی دواییدا، هەڵسام بە بڵاوکردنەوەی چاپی نوێی تەواوی کتێبەکانی کۆچکردوو وەردی، هەمان کات خانەی ئەلوەراق هەڵمەتێکی بەرفراوانی دژی ساختەکار و شێوێنەر و دزەکان دەست پێ کرد لە پێشانگە عەرەبییەکان و چەند بازارێکی عەرەبیدا، تا رێگری لە کتێبە ساختەکان بکات، لەمەدا، تا رادەیەک سەرکەوتنمان بەدەست هێنا.

ئەوەی جێی دڵخۆشی بوو، ئەوە بوو سەرەرای ساختەکردن و شێواندنی کتێبەکانی وەردی، وەلی ناوی بووە ناوێکی درەوشاوە و ئامادە لە جیهانی عەرەبیدا، لە خۆرهەڵاتیەوە تا خۆرئاوای.

کۆچکردوو عەلی حسەین وەردیی زانا، لە ساڵی ۱۹۱۳دا،

## دەستپێک

لە شاری کازمیەی نزیک بەغداد و بەدیاریکراوییش لە گەڕەکی ئەنبارییەکان لەدایک بووە، لە خێزانێکی زانستیی ناسراو بەماڵی ئەبی وەرد، چونکە باوباپیرانی بە دڵۆپاندنی ئاوی گوڵەوە خەریک بوون، لە سەدان ساڵ لەمەوپێشەوە پیشەیەکی دیاری شارەکە بووە.

لە خوێندنگەکانی کازمیە، قۆناغەکانی خوێندنی تەواو کردووە، بە هۆی سەرکەوتنی لە خوێندندا، حکومەتی عێراق بۆ درێژەدان بە خوێندن، دەینێرێت بۆ زانکۆی ئەمەریکی لە بەیروت و بە پلەی شەرەف دەردەچێت. دواتر دەگەڕێتەوە بەغداد و بۆ ماوەی سێ ساڵ وانە دەڵێتەوە، پاشان حکومەت دەینێرێت بۆ زانکۆی تەکساس لە ئەمەریکا، تا بڕوانامەی ئەکادیمیی باڵا لە زانستە کۆمەڵایەتییەکاندا بەدەست بهێنێت، نامەی ماجستێرەکەی، کە پێشکەش بە زانکۆی ناوبراوی کرد، بریتی بوو لە *لێکۆڵینەوەیەک لە سۆسیۆلۆژیای ئیسلام*، ساڵی ١٩٤٨، بە پلەی شەرەف بڕوانامەی ماجستێر بەدەست دەهێنێت، پاشانیش ساڵی ١٩٥٠، لە هەمان زانکۆ، بڕوانامەی دکتۆرا بەدەست دەهێنێت. تێزی دکتۆراکەشی بریتی بوو لە *تیۆری مەعریفە لای ئیبن خەلدوون*. ساڵی ١٩٥٠ دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد و لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی بەغداد، وەک مامۆستا، دادەمەزرێت.

دکتۆر وەردی بە یەکەمین ڕابەری دامەزرێنەری کۆمەڵناسی لە تەواوی جیهانی عەرەبیدا هەژمار دەکرێت، وەک زانستێکی سەربەخۆ لە زانستە مرۆییەکانی دیکە. وەردی تا ساڵی ١٩٦٩ بەردەوام دەبێت لە وانەوتنەوە، لەو

ساڵەدا و لەسەر داوای خۆی خانەنشین دەکرێت، تا خۆی بۆ توێژینەوە و نووسین تەرخان بکات.

## کتێب و توێژینەوەکانی وەردی

ڕۆژنامە و گۆڤارە عێراقییەکان، لە ناوەڕاستی چلەکانی سەدەی ڕابردووەوە بە دکتور عەلی وەردی ئاشنا بوون، کاتێک وتارگەلێکی بە شێوازی خۆی بڵاو کردەوە، تاکوو نەوەدەکانی سەدەی ڕابردووش بەردەوام بوو لەسەر نووسین لە ڕۆژنامە عێراقییەکاندا. ئەمڕۆ دکتور تاریق ئەلعەمدانی و تیمێکی تایبەت ڕاسپێردراون تەواوی کار و وتار و توێژینەوەکانی دکتور عەلی وەردی کۆ بکەنەوە، کە لە ساڵانی نێوان ١٩٤٥-١٩٩٥ لە ڕۆژنامە و گۆڤارە عێراقی و عەرەبییەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە. هیوامان وایە ئەم کارە لە ساڵی ئایندەدا بە کۆتا بگات.

## کتێبە چاپکراوەکانی وەردی

١. *کەسێتیی تاکی عێراقی* / ١٩٥٠- بەغداد.
٢. *کاریگەریی ئەست* / ١٩٥١- بەغداد.
٣. *واعیزەکانی سوڵتان* / ١٩٥٤- بەغداد.
٤. *گاڵتەجاڕیی عەقڵی مرۆڤ* / ١٩٥٥- بەغداد.
٥. *ئەفسانەی ئەدەبی باڵا* / ١٩٥٧- بەغداد.
٦. *خەونەکان لەنێوان زانست و بیروباوەڕدا* / ١٩٥٩- بەغداد.
٧. *لۆژیکی ئیبن خەلدوون* / ١٩٦٢- قاهیرە.

٨. *لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراق*/ ١٩٦٥- بەغداد.

٩. *چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق*/ ١٩٦٩-١٩٧٩ (شەش بەرگ لە هەشت کتێبدا، کە ئەمانەن: بەرگی یەکەم- ١٩٦٩، بەرگی دووەم- ١٩٧١، بەرگی سێیەم- ١٩٧٢، بەرگی چوارەم- ١٩٧٤، بەرگی پێنجەم (دوو کتێب)، کتێبی یەکەم- ١٩٧٧، کتێبی دووەم- ١٩٧٨، بەرگی شەشەم (دوو کتێب)، کتێبی یەکەم- ١٩٧٨، پاشکۆی بەرگی شەشەم- ١٩٧٩).

١٠. *ئاکار، بزربوو لە بەرامبەر رەوشتناسێزەکاندا*/ ٢٠٠٧ - لەندەن-بەیروت.

١١. *چیرۆکی خانەدانەکان و ئیبن سعود* (کە پاشکۆی بەرگی شەشەمە و بە شێوەیەکی سەربەخۆ چاپ کراوە).

**ئەو کتێبانەی بۆ یەکەم جار و دوای مردنی وەردی ئامادە دەکرێن بۆ چاپ:**

١. *لێکۆڵینەوەیەک لە سوسیۆلۆژیای ئیسلام*/ ١٩٤٨-تەکساس/ ئینگلیزی (نامەی ماجستێرەکەیەتی) ئەم کتێبەیە، کە لەبەر دەستی ئێوەدایە.

٢. *تیۆری مەعریفە لای ئیبن خەلدوون*/ ١٩٥٠-تەکساس/ ئینگلیزی (تێزی دکتۆراکەیەتی) ئێستا کاری لەسەر دەکرێت و ئاواتەخوازین ساڵی ٢٠١٤ بە زمانی عەرەبی چاپ بکرێت.

ئەم دوو کتێبەی سەرەوە، تا وەردی لە ژیاندا بوو، نەکران بە عەرەبی. کاتێکیش لەم بارەیەوە پرسیاری لێ

دەکرا، دەیوت: هەموو شتێک لە کاتی خۆیدا.

٢. کۆی ئەو تار و توێژینەوانەی عەلی وەردی لەنێوان ساڵانی (١٩٤٥-١٩٩٥) لە ڕۆژنامە و گۆڤارەکاندا بڵاوی کردوونەتەوە، کە دکتۆر تاریق نافیع ئەلحەمدانی ئامادەی کردووە و لێی کۆڵیوەتەوە.

چەند مانگێک بەر لەوەی وەردی کۆچی دوایی بکات، پێی ڕاگەیاندم چەند کتێبێکم بۆ دەنێرێت و حەز دەکات چاپیان بکات، بەڵام بەداخەوە، دوای مردنی بزر بوون، ئەوانیش:

١. تەواکاری کتێبی (*چەریەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق*) بەرگی حەوت و هەشت.

٢. *ژیانم*، یان *بەشێک لە ژیانم*، کە پێک هاتووە لە بیرەوەرییە کەسییەکانی.

٣. کتێبێک، کە کۆچکردوو ناوی نەنابوو، بەڵام پێی دەوت (*پڕۆژەی تەمەن*)، کە کۆچکردوو میر بەصری لە بەرگی سێیەمی کتێبەکەیدا (*ئاوەدانی عێراق*) لاپەڕە ٤٢١، باسی لێوە کردووە. پێدەچێت هەمان ئەم پەرتووکە بێت، کە ئەو بە (*سەرگوزشتی مرۆڤ*) ناوی بردووە.

٤. کتێبەکانی ناو گەنجینەی وەردی، کۆچکردوو کاتێک لە نووسینی کتێبێک تەواو دەبوو، دەیخستە زەرفێکەوە و لەسەر زەرفەکەش ناونیشانی کتێبەکەی دەنووسی و دەیخستە گەنجینەیەکی دارینی ماڵەکەیەوە، کاتێک پرسیارمان لێ کرد کەی ئەم کتێبانە چاپ دەکات، لە وەڵامدا وتی: هەموو شتێک بۆ کاتی خۆی!

**ئەو کتێبانەی لەناو کتێبە چاپکراوەکانیدا ناویان هاتووە و بەڵام چاپ نەکراون:**

١. *دەروونناسیی کەسێتیی عێراقی.*

٢. *عێراق و سارانشینی*[1].

٣. *مێژووی ململانێی تایەفی لە عێراقدا.*

٤. *جەقیقەتی ون لە ئیسلامدا.*

٥. *نهێنیی کەسێتی.*

٦. *شوێنی سەرهەڵدانی بزووتنەوە کۆمەڵایەتییەکان لە ئیسلامدا.*

٧. *کەشەکردنی هۆشیاریی سیاسی لە عێراقی نوێدا* - کۆچکردوو کورکیس عەواد لە بەرگی دووەمی *ئینسایکلۆپیدیای نووسەرە عێراقییەکاندا* لاپەڕە ٤٣٨، باسی لێوە کردووە. هەروەها کۆچکردوو میر بەصری لە بەرگی دووەمی *ناودارانی ئەدەب لە عێراقی نوێدا*، لاپەڕە ٥٥٠، باسی کردووە. کۆچکردوو هاشم ڕەجەب لە گۆڤاری *المکتبة*، کە کتێبخانەی موسەننا دەری دەکرد، لە ژمارە ٦٦ی ساڵی ١٩٦٨، لاپەڕە ٥٣، باس لەوە دەکات: وەردی بەرگی یەکەم و دووەمی ئەم کتێبەی تەواو کردووە، هەر بەرگێک، نزیکەی ٧٠٠ لاپەڕەیە و باس لە ماوەی وەرچەرخانی سیاسی لە عێراق دەکات، لە ساڵانی ١٩٠٦-١٩٢٤، دوای ئەوەی عێراق لە قۆناغی نەستیی سیاسییەوە ڕوو دەکاتە قۆناغەکانی

---

[1] سارانشینی: مەبەستمان لە چەمکی "البداوة"ی عەرەبییە، کە عەلی وەردی لە ئیبن خەلدوونەوە وەری گرتووە. (و. ک.)

هۆشیاریی سیاسی و ئەو فاکتەرانەی لەم وەرچەرخانەدا ڕۆڵیان گێڕاوە. بەرگی سێیەم باس لە ڕووداو و فاکتەرەکانی ساڵانی نێوان (١٩٢٤-١٩٤١) دەکات، بەرگی چوارەم باس لەو قۆناغە دەکات، کە بە ١٩٥٨ کۆتایی دێت، وەلێ بەرگی پێنجەم و کۆتاییی بریتییە لە عێراق دوای ساڵی ١٩٦٨.

ماجید شبر

# عەلی وەردی و میتۆدەکەی

د. حسەین ئەلهەنداوی[1]

بایەخدان بە بیریاری کۆچکردوو دکتۆر عەلی وەردی، لە سەدەی بیستویەکدا ڕووی لە فراوانبوون کرد و لێکۆڵینەوەش لە هزرەکانی دەربارەی کۆمەڵگەی عیراقی، لە تەواوی جیهاندا قووڵتر بوونەوە. ئەو نۆ کتێبەی لە ماوەی ژیانیدا چاپ کران، لەپێش هەمووشیانەوە (*چەردەیەکی کۆمەڵایەتی لە مێژووی نوێی عێراق*) بە هەر هەشت بەرگەکەیەوە، چەندین جار چاپ کراون و چەند بەشێکیشی بۆ چەندین زمان وەر گێڕدراون، وەک: فەرەنسی، ئەڵمانی، ئینگلیزی، ئیسپانی، فارسی، تورکی، پۆلۆنی و هتد. زانکۆکانیش

1 د. حسەین ئەلهەنداوی: نووسەرێکی عیراقییە، لە بواری فەلسەفەدا خاوەن چەند کتێبێکە: (*هیگل و ئیسلام*، ١٩٨٧، بە زمانی فەرەنسی) و (*مێژوو و دەوڵەت لەنێوان ئیبن خەلدوون و هیگلدا*، بەیروت، دار ئەلساقی، ١٩٦٦) و (*لەکەناری فەلسەفەدا*، بەغداد، دار ئەلحیکمە، ٢٠٠٥). لە زمانی فەرەنسییشەوە ئەم کتێبانەی کردووە بە عەرەبی: (*هیگل و هیگلیزم*، بەیروت، ئەلتنوز ئەلئەدەبییە، ٢٠٠٤)، (*محەممەدی مەککەیی و ئاوەدانکاریی هاوچەرخ*، بەیروت، ناشیرون، ٢٠١٣)، (*هەڵەسەروتانی ڕۆشنگەر و ئیسلام*)، (*چەوساندنەوەی خۆرهەڵاتییانە، یان چەوساندنەوەی خۆرهەڵات؟*)، (*دەروازەیەک بۆ فەلسەفەی بابلی*) و چەندین کتێبی دیکە...

لێرەولەوی بایەخدانیان بە لێکۆڵینەوەی تایبەت، رووی لە زیادبوون کردووە و تا هەنووکەش، تیزە سەرەکییەکانی دەربارەی سروشتی کەسێتی عێراقی هاوچەرخ، بووەتە جێی مشتومڕێکی زانستی و سیاسیی فراوان. راڤە و لێدوانی ئاڵۆز و جیاجیا و هەندێک جاریش دژیەکی بۆ دەکرێت.

لەنێو تەواوی بیریارە هاوچەرخەکانی عێراقدا، لە بواری کۆمەڵناسیدا، تا ئەمڕۆ کەس ئەو سەرکەوتنەی ئەوی بەدەست نەهێناوە، تەنانەت لە رووی جەماوەرییشەوە، بەتایبەت سەبارەت بە ژمارەی ئەو بابەت و هزرانەی ناوبانگێکی مەزنی لای تەواوی خەڵکی پەیدا کردووە، کە هەندێک جار بەهۆی وردییە رەسەنەکەیەوەیەتی. ئەم هزرانە لەگەڵ ئەو وێناکردنانەی بەرهەمیان دێنن، توانییان ناوەندی ئەکادیمی پاوان بکەن و بچنە نێو چالاکیی تێروانینەکانەوە، تا وای لێ هات، لەسەر هەموو سفرەیەک ناوی عەلی وەردی بهێنرێت.

دەتوانین زۆر بەسانایی لەم بایەخدانە گەورەیە بە وەردی تێبگەین، ئەم بیریارە کۆمەڵایەتییە، لە یەک کاتدا هەم نوێگەر بوو هەم بوێر، یەکەم کەسیش بوو بانگەشەی بۆ "کۆمەڵناسیی عەرەبی" کرد، تا لەژێر رۆشنایی تایبەتمەندییە جوگرافی-مێژوویی-کولتوورییەکاندا، لە کۆمەڵگە عەرەبییەکان بکۆڵێتەوە. هەروەها تێروانینێکی گشتگیر و هاوبەند و کراوە دەربارەی دۆخی کۆمەڵگەی عێراقی لە چوارچێوە مێژووییە هاوچەرخەکەیدا پێشکەش دەکات و پێشوەختەش لە دەردە درێژخایەنەکانی ئاگادارمان دەکاتەوە. ئەم تێروانینەش، سەرەرای ئەوەی بە شێوەیەکی

تەواوەتییش قبوڵ ناکرێت، یان زۆر توندە، وەلێ پێویستییەکیی هزری فراوان پڕ دەکاتەوە، بۆ تێگەیشتن لەو کۆمەڵگەیە و ئاستو و ناوەڕۆکی زیندوێتییەکەی و ڕەگەزەکانی، هەروەها بۆ ئاشنابوون بە فاکتەرە خودی و بابەتییەکانی پەرەسەندن و شکستەکانی.

کرۆکی هزریی کۆمەڵایەتیی عەلی وەردی، لە چەندین بواردا گوزارشت لە خۆی دەکات، وەلێ بەتایبەت ئەوەی بە چاپی گەیاندووە، پەرەدانە بە میتۆدێکی ڕەخنەییی دیالێکتیکیی تایبەت، لەگەڵ جەختکردنەوەی لەسەر بایەخی یەکلاکەرەوەی ئەم میتۆدە لە تەواوی بوارەکانی لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگەی عێراقی و عەرەبی، لە ڕوانگەیەکیی کۆمەڵایەتی مێژووییەوە. خۆ ئەگەر وەردی لە ڕاڤەکردن یان دەرئەنجامدا کەوتبێتە هەڵەوە، وەلێ بە لایەنی کەمەوە جەختی لەسەر بوونی کۆمەڵگەیەکی عێراقیی گەورە و زیندوو و ئەفرێنەر کردۆتەوە، کە لە بەردەوامییە هاوبەندە سروشتییەکەی و یەکێتیی هاودژییەکانی پێک دێت و لێواتلێوییشە لە پەرەسەندن و بەرزبوونەوە.

ئێستا، دوای تێپەڕینی دوو دەیە لە کۆچی دوایی وەردی، بە پێویستی دەزانین سەرنجێکی نوێ لە تێڕوانینە کۆمەڵایەتییە تایبەتییەکەی بدەین و تەواوی پەرەسەندنە جەوهەرییەکانی لە بەرچاو بگرین و بنەما ڕەسەنەکانیشی بخەینەوە یاد، ئەو ڕوانگانەشی بپشکنین، کە لە سانە بالاکانیدا یان دواساتەکانیدا هەیبووە، ئەو پرسیارانەش بوروژێنینەوە، کە بەردەوام ئامادەییان هەیە. بە هەرحاڵ، پێمان وایە پێداچوونەیەکی ڕەخنەیی بە هزرەکانی وەردیدا،

بەتایبەت لەم کاتەدا، سوودبەخشە، لە کاتێکدا ئەم کۆمەڵگەیە لەسەر پەرەسەندنە جێگیرەکەی بەردەوامە، هەر وەک چۆن لەسەر ڕێڕەوە شپرزە و وروووژێنەرەکەشی بەردەوامە.

وەلی لێکۆڵینەوەیەکی ئاوا کورت، ناتوانێت تەنانەت جەخت لەسەر لایەنە سەرەکییەکانیشی بکاتەوە، ئەمەش پۆزشە بۆ ناتەواوییەکانی و کەلێنەکانی. بەدڵنیاییشەوە، دواتر چەند هەوڵێک دەدرێن بۆ لێکۆڵینەوە و خوێندنەوەی نوێ، بە ئامانجی وروووژاندنی چەند بابەخێپدانێکی زیاتر و کردنەوەی چەندین ئاسۆی دیکە. گومانمان نییە لەوەی ئەم کتێبە هەموو ئەمانە لەخۆ دەگرێت. بیریاری کۆچکردوو، زۆر سەرسەختانە دەیویست توێژەرێکی زانستی ڕاستگۆ و ڕەخنەگر و ئازاد بێت. تا هەنووکەش پێویستی بە لێکۆڵینەوەی زیندوو هەیە و بەردەوام بووەتە جێی سەرسامیی گەرموگوڕ و ڕاقەی سەرکێشانە و جەنگ و ڕەخنە. هەموو ئەمانەش، ئاماژەن بۆ سەرکەوتنی گەورەی ئەو.

بەگشتی، لێکۆڵینەوەیەکی سەراپاگیر و میتۆدی لە تێڕوانینی کۆمەڵایەتیی وەردی بە پێویست دەزانین، وەلی پێویستیشە بە مەعریفەیەکی وردەوە تەواوی ئەو کتێبانەی پێشتر لە چاپ دراون، بەراورد بکرێن بەو کتێبانەی هێشتا لە چاپ نەدراون، پێدەچێت - وەک ماجید شبر لە دەستپێکی ئەم کتێبەدا باسی لێوە کردووە - ژمارەی کتێبە لەچاپنەدراوەکان زۆر بن، بەتایبەت ئەو کتێبەی ناوی ناوە *لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی مرۆڤ*، خودی خۆشی بە پڕۆژەی تەمەن ناوی بردووە، وەردی تا دوارۆژەکانی تەمەنی، سەرقاڵی ئەم بابەتە بووە، هەندێک کەسیش جەختیان لەسەر ئەوە

کردۆتەوە، کە وەردی لە دانیشتنە تایبەتی و گشتییەکاندا بەردەوام باسی لە بەرەوپێشچوونەکانی لە کتێبی ناوبراودا کردووە و تەنانەت هەندێک دەستنووسیشی خستووەتە ڕوو. بە دووری نازانین، بڵاوبوونەوەی ئەو کتێبە بەشێک لە لایەنە جێگیرەکانی بۆچوونمان دەربارەی تێڕوانینی بۆ سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی لەق بکات، تەنانەت خودی خۆشی لە ساڵی ١٩٨٨دا لە چاوپێکەوتنێکی ڕۆژنامەوانیدا ئاماژە بەمە دەکات و دەڵێت: "ئەو ڕاتەکاندنە کۆمەڵایەتییەی عێراق لە ١٤ی تەممووزی ١٩٥٨دا بە خۆیەوە بینی، زۆرێک لە تێگەیشتن و تیۆرەکانی منی بۆ ژیان و کۆمەڵگە هەڵگێڕانەوە، بەر لەوە تێڕوانینێکی تایبەتم هەبوو بۆ ژیان و کۆمەڵگە، پاشان ئەو ڕووداوانەم بینین، کە لە تەممووزی ١٩٥٨ و دواتردا ڕوویان دا، ئەوکات درکم بەوە کرد، من لە تیۆرە کۆنەکەمدا، دەربارەی سروشتی مرۆڤ، بە شێوەیەکی گشتی و سروشتی کۆمەڵگەی عێراقی بە شێوەیەکی تایبەتی، هەڵە بووم."

لە چاوەڕوانیی ئەو دەقانەدا، پێمان وایە لەمیانەی ڕوونکردنەوەی بنەما هزرییەکانیەوە و پشکنینی میتۆدە تایبەتەکەی و ئامرازە شرۆڤەکارییەکانیەوە، هەروەها لەمیانەی دەرئەنجامە گشتییەکانیەوە دەربارەی کۆمەڵگەی عێراقی، بەچاوپۆشین لە واقیعبوونی ناوەڕۆکە جەوهەرییەکانی و پەسەندکردنی لەلایەن ئێمەوە، دەتوانین هەڵسەنگاندنێکی سەرەتایی بۆ تێڕوانینی کۆمەڵایەتیی وەردی بکەین.

**بنەما هزرییەکان:**

لەسەر ئاستی بنەما یان سەرەتا هزرییەکان، بە ڕای ئێمە هەڵەیە پێمان وا بێت وەردی یەک ئاراستەی هزری یان فەلسەفیی گرتووە، وەک هەندێک پێیان وایە کاریگەر بووە بە فەلسەفەی پراگماتیزم (زیاتر لەوانی دیکە)، یان بە هۆی نەشارەزاییمانەوە تۆمەتباری بکەین بەوەی (تێڕوانینێکی خۆرئاواییی خۆرهەڵاتناسییانەی لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی عێراقی!)دا بوونیاد ناوە. بە ڕای ئێمە، وەردی هەرگیز یەک ڕێبازی فەلسەفیی دیاریکراوی نەگرتۆتە بەر، هەر وەک چۆن لەنێو ڕێبازەکانیشدا نەمبەراوبەری نەکردووە. بەڵکوو بیریارێکی ڕەخنەگر و ئازاد بووە، دوور لە بیری ئایینی یان فەلسەفی، لە مامەڵەکردنیدا لەگەڵ دیاردەکانی کۆمەڵگەی عێراقیدا، چەند هەڵکشانێکی بە خۆی و بە میتۆدەکەی بەخشیوە، کە تاکوو ئێستاش لە چەند پێکهاتەیەکیدا، لە قاڵبوەرگرتندایە. بەدیاریکراوییش لایەنی بەهێز و لاوازی میتۆدەکەی وەردی لێرەدا دەر دەکەوێت، هەندێک جار هەڵی لێکۆڵینەوە یان بەرێکەوت یاخود توێژینەوەکە پێویستی کردووە وا بێت، ڕەگەزگەلێکی ئاڵۆز و تەنانەت لێکدیجیاوازیش، کە لە یەک کاتدا چەندین هزری گرتۆتە خۆی، لەوانە، ئەو هزرانەی لە کولتووری عەرەبییەوە وەری گرتوون، لەنێویشیاندا شیعری جاهیلی، هزرە ڕەخنەییەکانی فەیلەسووف و بیریارە عەرەب و مسوڵمانەکان، بەتایبەت جاحیز و ئەبی حامیدی غەزالی و هزرە سۆفیگەرییەکان.

سەرەرای کاریگەربوونی قووڵ و ئاشکرای بە عەبدولرەحمان ئیبن خەلدوون، کە تیۆریی (ململانێی سارانشینی و شارستانیەت)ی لێوە وەر گرتووە و بە شێوازی خۆی پراکتیزەی کردۆتەوە، لەمەشدا، بە میتۆدی (ئەزموونگەرای)ی فرانسیس بیکۆن و میتۆدی (پۆزەتیڤیزم)ی ئۆگست کۆنت، کاریگەر بووە.

لە لایەکی دیکەوە، بە سۆسیۆلۆژیای ئەمەریکی کاریگەر بووە، کە تا رادەیەک خۆی لە ریبازە فەلسەفییە تەقلیدی و ئایدیۆلۆژییەکان جیا کردۆتەوە، بەتایبەتی تیۆریی (دوالیزمی کەسیتی)ی رۆبەرت مەکایڤەر-Robert Maciver و تیۆریی (هاودژیی کۆمەڵایەتی)ی سۆسیۆلۆژیستی ئەمەریکی، ولیەم ئۆگبێرن-William Ogburn (١٨٨٦-١٩٥٩). لە لایەکی دیکەشەوە بەو هزرانەی لە دەروونناسیی کۆمەڵایەتی ئەمەریکییەوە وەری گرتوون، کاریگەر بووە، بەتایبەت جۆرج هێربەرت مید-Georg Herbert Mead (١٨٦٣-١٩٣١)، کە دامەزرێنەری قوتابخانەی (کارلێکی سیمبولی-Symbolic Interaction)یە لە شرۆڤەکردنی یەکە کۆمەڵایەتییەکان و کیانە بچووکەکان یان تاکەکان. هەروەها تۆرستین ڤێبلن-Thorstin Veblin (١٨٥٧-١٩٢٩)، دامەزرێنەری تیۆریی بەسترانەوەی حەتمیی نێوان تەکنەلۆژیا و تەرزی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها کارل مانهایم-Karl Mannheim (١٨٩٣-١٩٧٤) و فێردیناند کۆهن-Ferdinand Cohn (١٨٢٨-١٨٩٨) و چەندین بیریاری دیکەی قوتابخانەی مێژوویی ئەڵمانی، کە هەندێکیان هاوسەردەمی وەردی بوون، یان چارلس کولی-Charles Cooley (١٨٦٤-١٩٢٩)،

خاوەنی تیۆریی (مرۆڤ لە ئاوێنەدا)، (واتا مرۆڤ خۆی لە چاوی تاکەکانی دیکەی کۆمەڵگەوە دەبینێت). سەرەرای تیۆرەکانی سۆسیۆلۆژیستە کلاسیکییەکانی وەک، ئۆگست کۆنت-Auguste Comte (١٧٩٨-١٨٥٧)، دامەزرێنەری سۆسیۆلۆژیای ئەزموونی، یاخود ولیەم جەیمس-William James (١٨٤٢-١٩١٠) و چەندانی دیکە.

بە رای ئێمە، ناتوانین لە تێروانینی وەردی بۆ کۆمەڵگەی عێراقی تێبگەین، ئەگەر سێ تێزە سەرەکییەکەی (ململانێی سارانشینی و شارستانیەت، دوالیزمی کەسێتی، هاودژیی کۆمەڵایەتی) وەک یەک یەکە وەر نەگرین، خۆ ئەگەر یەکێکیان جودا بکەینەوە، ئەوا تێروانینی وەردی بۆ کۆمەڵگەی عێراقی لەنگ دەبێت. هەر لە بڵاوبوونەوەی یەکەمین کتێبیەوە *کەسێتیی تاکی عێراقی* لە ساڵی ١٩٥١دا، ئەم چەمکانە لە بەدوایەکداهاتنیاندا وەک لە سەرەوە خراونەتە روو، یەکدی بەرهەم دەهێنن. لە لایەکەوە ناتوانین یەکێکیان پێش ئەوانی دیکە بخەین، چونکە (ململانێی سارانشینی و شارستانیەت) (دوالیزمی کەسێتی) بەرهەم دەهێنێت و پێچەوانەکەی راست نییە، لە کاتێکیشدا (هاودژیی کۆمەڵایەتی) بەرئەنجامی (دوالیزمی کەسێتی)یە.

یەکەمین چەمک، واتا (ململانێی سارانشینی و شارستانیەت)، کە دەقاودەق بە مانا خەلدوونییەکەی وەر گیراوە، ئەو دەستپێکەیە، رێگەی بە وەردی دا بەچەند دەرئەنجامێک بگات، دوای ئەوەی بەسەر وڵاتی دووروویاردا پراکتیزەی کرد. کۆمەڵگەی عێراقیی نوێ، جگە لە بەرئەنجامی ئەو ململانێیە، چیی دیکە نییە، چونکە لە بیاباندا رووی داوە، بیابانیش

لە لایەکەوە، لەپێش سەدەی بیستدا، میراتگری چەندین شارستانیەتی مرۆیی مەزنە، ئەم دووانە جوگرافی-مێژووییە، لای خۆیەوە دووانەی کۆمەڵایەتی-مێژوویی بەرهەم هێناوە، نەک دەروونی یان نەخۆشی. وەردیش چەندین جار جەختی لەسەر ئەوە کردۆتەوە، کە چەمکی (دوالیزمی کەسێتی) لێکدانەوەی هەڵەی بۆ کراوە، ئەم دوالیزمە بە هۆی بەریەککەوتنی دوو سیستمی دژیەکی بەهای نێو ڕەفتاری گشتی، نەک نێو ڕەفتاری تاکەکان، دروست دەبێت. هەر وەک چۆن بەتەنها لەسەر دۆخی عێراقیش پراکتیزە ناکرێت.

چەمکی کۆتایی زنجیرەکەش (هاودژیی کۆمەڵایەتی)، لە چەمکی کەلێنی شارستانی، یان کەلێنی کولتووری زانای ئەمەریکی ولیەم ئۆگبێرنەوە وەر گیراوە، کە لە ساڵی ١٩٢٢ و لە کتێبی *گۆڕانی کۆمەڵایەتی* (Social Chang)دا باسی لێوە کردووە. بە شێوەیەکی تایبەتی بەو هێزەی گۆڕانی تەکنەلۆژی دەبەستێتەوە بە گۆڕانی کۆمەڵایەتی-کولتورییەوە، گوزارشتی لێ کردووە و دەڵێت: ئەو پێشکەوتنە خێرایەی لە بوارەکانی ژیانی ماددی یان ڕۆژانەدا روو دەدات، بە هۆی کەڵکوەرگرتن لە بەدەستهێنراوەکانی پێشکەوتنی زانستی و بەکارهێنانی دۆزینەوە تەکنیکییە نوێکان و زۆرپەرەسەندووەکان لە ئامراز و شێوازەکانی پڕکردنەوەی پێداویستییەکاندا، خۆشگوزەرانییەکی گشتی دێنێتەدی، وەلی زۆرکات ئەم پێشکەوتنە هاوشان نییە لەگەڵ پێشکەوتنی گشتیی هزر و بەها و ئاکارە کۆمەڵایەتییەکان و مومارەسە ڕەفتارییەکان و مانا کولتووری و ڕۆحییەکان،

کە لە دانانی یاساوڕێسای نوێی گونجاو لەگەڵ ئەم پەرەسەندنە ماددییەدا ڕەنگ بداتەوە. بەر لە ولیەم ئۆگبێرن، چەندین هەوڵ هەبوون بۆ بەستنەوە و لەیەکدانی گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان بە وەرچەرخانە ئابوورییەکان و بە پێچەوانەشەوە، بەڵام چەمکی (کەلێنی کولتووری)، ڕێگە بەوەش دەدات گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی و کولتووری و ئابوورییەکان بخاتە چوارچێوەیەکی فراوانەوە.

لەگەڵ هەندێکدا هاوڕاین، کە پێیان وایە خوێندنەوەی ئیبن خەلدوون لەلایەن وەردییەوە "دووبارە تیۆریی خەلدوونی بوونیاد دەنێتەوە، تەنانەت هەڵیشی دەگێڕێتەوە" بەو پێیەی ململانێی سارانشینی و شارستانیەتی خەلدوونی، لەسەر بنچینەی دوو تەرزی هاودژ/ کارلێککردووی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت، لە کاتێکدا لای وەردی لەسەر دوالیزمی بەهاییی نێو یەک ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دروست دەبێت. هەر وەک چۆن لەگەڵ ئەو وتەیەشدا هاوڕاین، کە چەمکی وەردی دەربارەی (دوالیزمی کەسێتی) زۆر لە چەمکی مەکایڤەر دوورە، هەمان شت سەبارەت بە (هاودژیی کۆمەڵایەتی) بەراورد بە تیۆریی ولیەم ئۆگبێرن، بەڵام تەواوی ئەم بۆچوونانە، جگە لە جەختکردنەوە لەسەر بلیمەتیی وەردی، چیی دیکە نین، تەنانەت لە لێکۆڵینەوەشیدا لە کەسێتیی عێراقی لە پێدراوی ئەزموونگەری وەرگیراو لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیی شرۆڤەکاری یان بەراوردکارییەوە سەرچاوەی نەگرتووە، بەڵکوو تەنها پشتی بە کۆمەڵێک گریمانەی پێشوەختە و تێڕامانی مێژوویی بەستووە، بەم شێوەیەش، گەیشتووە بە بەرئەنجامەکانی.

لەگەڵ ئەوەشدا، وەردی هەرگیز وای پیشان نەداوە، تیۆرییەکی تایبەت بە کۆمەڵناسیی داهێناوە. ریشەی خۆنەویستی و خۆشەویستیی خەڵک و قوربانیدان، بە ناخی بیریاری کۆچکردوودا ڕۆ چوونەتە خوارەوە، بە پلەیەک، تەنانەت رێگریی ئەوەشیان کردووە بڵێت من خاوەنی ئەم تێڕوانینە بلیمەتانەیە، یان ئەو هەوڵە زانستییە نوێیەم لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵگەی عێراقیی نوێدا، لە کاتێکدا، ئەوانەی لە کۆمەڵناسیی عێراقی و بیانیدا کار دەکەن، دانیان بەوەدا ناوە، وەردی دامەزرێنەر و رابەریەتی.

سەرەرای ئەوەی وەردی بەدرێژایی ساڵانی توێژینەوەی، تەوەر و ڕێوشوێنەکانی ئەم تێڕوانینەی کەڵەکە کردووە و بە شێوەیەکی پلەپلە، پەرەی پێ داوە و هەندێک جاریش لە چەند رەگەزێکی لاوەکی و بنچینەییەکانی پاشگەز بۆتەوە، بەڵام ئەوەی لە ڕووی میتۆدییەوە بەجێگیری ماوەتەوە، ئەوەیە کە هەوڵی داوە لەژێر ڕۆشنایی سێ تیۆرەوە، کە لەلایەن چەند بیریارێکی ناسراوی پێش خۆیەوە داهێنراون، دیاردەکانی کۆمەڵگەی عێراقی بەشێوەیەکی فراوان و زانستی راڤە بکات. وەلێ وەردی - کە لایەنی رەسەنایەتیی هزرەکەی لێرەدا خۆی حەشار داوە - دەقاودەق ئەم گریمانانەی بەسەر ڕووکار و ئاکاری کۆمەڵگەی عێراقیدا پراکتیزە نەکردووە، بەڵکوو تەنها سروشتی لێوە وەر گرتوون، بێ دوودڵی دەستکاریی کردوون، یاخود دووبارە دای ڕشتوونەتەوە، تەنانەت ئەگەر پێویستیشی کردبێت، لە چەند ڕوویەکەوە لێیان دوور کەوتۆتەوە. هەر وەک چۆن تەنها لە بونیادنانی تێڕوانینە تایبەتییەکەیدا سوودی

لی وەر نەگرتوون، بەڵکوو هەندێک جاریش بە چەندین هزری جەوهەری دەوڵەمەندی کردوون، کە لە بیریار و کۆمەڵناسیی دیکەوە وەری گرتوون.

ڕوون و ئاشکرایە، ئەو کاتەی وەردی بە مەبەستی خوێندن لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بووە، هەوڵێکی تایبەتیی داوە تا بە گرنگترین، بەڵکوو بە تەواوی تیۆرەکانی کۆمەڵناسی ئاشنا ببێت، کە ئەو کات ژمارەیان کەم و نوێش بوون، چونکە کۆمەڵناسی وەک زانستێکی سەربەخۆ لە فەلسەفە و دەروونناسی بەدیاریکراوی لە سەدەی نۆزدەدا سەری هەڵدا. ئەو تیۆرییانەش زۆرینەیان ڕەخنەیی و هەندێکیشیان ئەزموونی بوون، بەتایبەت ئەو تیۆرییانەی بە تیۆریی حەتمی ناسراون. لایەنی ڕەخنەیی وەردییان قووڵتر کردەوە، کە پێشتر بە هزری چەند فەیلەسووف و بیریارێکی عەرەبی و مسوڵمانی ڕەخنەیی تیژ کرابوون، بەتایبەت هزرەکانی جاحیز و ئەبی حامیدی غەزالی و ئیبن خەلدوون. هەر وەک هاوڕێی شاعیری کۆچکردوو، عەبدوڵڵەمیر ئەلوەرد لە پێشەکیی چاپی نوێی کتێبی *لە سروشتی مەشتا سالییا*، کە سەلام شەماع بە چاپی گەیاندووە، دەڵێت، دوای ئەوەی وەردی خوێندنی زانکۆییی لە ئەمەریکا تەواو دەکات، بە شۆڕشێکی ناسیاسییەوە گەڕایەوە، شۆڕشێک بەسەر دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و مێژوو و بەهاکاندا، نە تەنها لە خۆرهەڵاتدا، بەڵکوو ئەگەر پێویستیشی کردبێت، لە خۆرئاوایشدا.

وەک لەپێشەوە باسمان کرد، بایەخدانی وەردی بە فەلسەفە، تەنها لە بواری زانستی لۆژیکدا بووە، بەگشتییش

هەڵبژاردن بووە، سەرەڕای ئەوەی بە تێپەڕینی کات، بە هۆی قووڵبوونەوەی وەردی لە لێکۆڵینەوە و تۆمارکردنی ئەو دیاردانەدا، کە تایبەت بوون بە کۆمەڵگەی عێراقیی نوێ و مێژووەکەیەوە، لەسەر حسابی هزریی ڕووت، بایەخدانی وەردی بە فەلسەفە بەرەو نەمان ڕۆیشتووە. ئێمە پێمان وایە بایەخدانی قووڵی وەردی بە فەلسەفە، تەنها لە ساڵانی پێش ١٩٦٠دا کورت دەبێتەوە، کە لەمیانەیەوە میتۆدێکی دەوڵەمەند و کارا کردووە، دەتوانین بە (دیالێکتیکی) ناوی ببەین، لەوانەیە ئەمە تاکە خستنەسەری سەرەکیی دوای ئەو ماوەیە بێت.

ئەم میتۆدە و سەرچاوە و ڕەگەزەکانی لە شرۆڤەکردنی ئەو دیاردانەدا، ڕەنگدانەوەی کاریگەری ڕوون و ئاشکرای لۆژیکی خەلدوونی لە گریمانە ناوەندییەکەیدا دەربارەی ململانێی سارانشینی و شارستانیەت پێوە دیارە. بەڵام گریمانە تەوەرەییەکانی دیکەی، بەتایبەت دوالیزمی کەسێتی و هاودژی و گۆڕان لەخۆ دەگرێت. ئەمەش ڕێگەمان پێ دەدات پێمان وا بێت تاکە سەرچاوەی وەردی، لۆژیکی ئیبن خەلدوون نەبووە، بەڵکوو ڕەنگدانەوەی دووراودووری کارلێکیشیەتی لەگەڵ فەلسەفە دیالێکتیکییە نوێکاندا، بەتایبەت هیگلی.

ئەمەش ئەو گریمانەیە پشتڕاست دەکاتەوە، کە وەردی، هیگلی وەک (یەکێک لەو فەیلەسووفە مەزنانەی بەشدارییان لە دروستکردنی لۆژیکی گۆڕانی نوێدا کردووە، هەژمار کردووە.) چونکە (تیۆرەکەی لەسەر بنچینەی بوونی هاودژی لە سروشتی شتەکاندا بووتیاد ناوە، بەمەش،

بەشێکی زۆر لەو لۆژیکە کۆنەی لەسەر بنەمای نەبوونی هاودژی بوونیادی نابوو، رووخاندووە) هەروەها لەبەر ئەوەی پێی وا بووە (وەک پرنسیپی ماهییەت دەڵێت، هیچ شتێک لە خۆیەوە دروست نابێت، بەڵکوو هەر دەبێت لە پێکهاتە و ناخیدا هاودژیی خۆی هەڵگرتبێت، بە هۆی بوونی ئەم هاودژییەشەوە لە پێکهاتەی شتەکەدا، گۆڕانی بەسەردا دێت. ئەمەش وای لە گەردوون کردووە، لە جوولەیەکی بەردەوامدا بێت و هەرگیز نەوەستێت).

ڕێی تێ دەچێت لاوازیی بایەخدانی زانکۆ ئەمەریکی و ئەنگلۆفۆنییەکانی ئەو کاتە، بەگشتی بە لێکۆڵینەوەی فەلسەفەی هیگل و مارکس، هۆکاری ڕاستەوخۆ بووبێت، کە ڕێگریی لە وەردی کردووە لە لێکۆڵینەوەی کتێبە سەرەکییەکانیاندا قووڵ ببێتەوە، بەتایبەت ئەو دەقانەی پەیوەندییان بە دیالێکتیکەوە هەبووە. ڕاستە گواستنەوەی دەقاودەقی چەمکە فەلسەفییەکان بۆ ناو کایەی کۆمەڵناسی، یان بوارەکانی دیکە، ڕێی تێ ناچێت، یان داهێنان نییە، بەڵام دیالێکتیکی هیگلی هاوشێوەی دیالێکتیکی خەلدوونییە لە فەلسەفەی مێژوودا، بەتایبەت لەو دۆزانەی تایبەتن بە پەرەسەندنی بازنەیی دروستبوون و ڕووخانی دەوڵەت و شارستانییەکاندا و تێگەیشتن لە دیاردەی ئاوەدانکاری مرۆیی و دینامیکیەتەکەی و چەندین تەوەری دیکە، کە لە تێڕوانینی خەلدوونیدا سەرنجی وەردییان بەلای خۆیاندا ڕاکێشاوە.

### میتۆدێکی نوێ:

هەرچۆنێک بێت، پەیبردنی وەردی بە لۆژیکی ئیبن خەلدوون، ئەو هۆکارە مەزنە بوو، وای کرد لەرووی هزرییەوە هەنگاوێکی گەورە بنێت و لە دواتردا تێزە زانکۆییەکەی بەجێ بهێنێت. بە لایەنی کەمەوە، میتۆدگەراییەکی نوێ و ڕەسەنی پێ بەخشی و بە شێوەیەکی هۆشیارانە و پێداگرانە ئەم میتۆدەی لە توێژینەوەی کۆمەڵایەتیدا بەکار هێنا، هەروەها لەو بەئەنجامگەیشتنانەشیدا بەکاری هێنا، کە لە لایەنی تیۆریدا دای ڕشتن. ئەم میتۆدە دیالێکتیکییە، وزەیەکی وێرانکەر بۆ بوونیادە دۆگماییەکان، لە لۆژیکی فەلسەفییەوە وەر دەگرێت، بەڵام بەبێ یاسا بەرهەمهێنەرەکانی هاوئاهەنگییە نوێکان، پاشانیش بۆ پەرەسەندن لە مێژوودا (یاخود لە کۆمەڵگەدا).

بایەخی پەیبردنی بە لۆژیکی خاوەنی *(المقدمة)* - دەبێ ئەوەش بزانین، بایەخدانی وەردی پێی، نوێ نییە، بەڵکوو دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژانی خوێندنی باڵا - لە لایەکەوە بەشێکی گەورەی لە نامەی دکتۆراکەی لە زانکۆی تەکساس ساڵی ١٩٥٠، بۆ تەرخان کردووە، لە لایەکی دیکەشەوە، ماوەی زیاتر لە دە ساڵ بەو و بە تەواوی ئەو کتێب و وتارانەی لەو بارەیەوە بڵاودەکرانەوە، کاریگەر بووە، هەر وەک خۆشی ئەمەی پشتراست کردۆتەوە. بەڵام تەنها دواتر درکی بەوە کردووە، کە (لە ڕووی لۆژیکییەوە) بێئاگا بووە، بەر لەوەی بپرسێت: "ئایا ئیبن خەلدوون لە بیرکردنەوەیدا لەسەر

میتۆدی لۆژیکی ئەرستۆ ڕۆیشتووە، کە فەیلەسووفانی ئیسلام لەسەری ڕۆیشتوون، یاخود لۆژیکێکی نوێ و تایبەت بە خۆی داهێناوە؟"

بە ڕای ئێمە، ئەم پرسیارە یەکەمین بناغەی میتۆدی تایبەتیی عەلی وەردییە لە کۆمەڵناسیدا. ئەویش میتۆدێکە، هەر لە سەرەتاوە لەسەر گەیشتنەئەنجامی چەمکی تیۆرییەوە، کە لەسەر بنەمای هەڵێنجان دامەزراوە، نەک بەرهەمهێنانی توێژینەوەگەلی پراکتیکی یان پەروەردەیی یان مێژوویی، ئەمەش وای کرد، ڕشتەگەلێکی نوێتر و ئاڵۆزتر دروست بکات. ئەم خەمە لە زیاتر لە بوارێکی هزریی کۆمەڵایەتیی عەلی وەردیدا ئاشکرا و زاڵە، سەرباری ئەوەی سەرکەوتنی تیایدا نادیارە.

ڕوون و ئاشکرایە، ئاگاداربوونی لە کتێبێکی بیریاری فەلسەفیی عێراقی، موحسین مەهدی، دەربارەی فەلسەفەی مێژوو لای ئیبن خەلدوون، کە ساڵی ١٩٥٧ بە زمانی ئینگلیزی چاپ کراوە، هۆکاری ڕاستەوخۆ بووە لە پەیبردنی بە قووڵاییەکانی لۆژیکی ئیبن خەلدوون. ئەم کتێبە یەکەمین توێژینەوەیە لە ڕووی فەلسەفی و لۆژیکییەوە لە تیۆریی خەلدوونی کۆڵیوەتەوە دەربارەی ئاوەدانکاری مرۆیی، لە کاتێکدا توێژەرەکانی پێش موحسین مەهدی، تەنها ئاماژەیان بە لایەنە کۆمەڵایەتییەکەی داوە. وەردییش بایەخدانی بەم کتێبە و سەرسامبوونی بە موحسین مەهدی ئاشاریتەوە و دەنووسێت: "ئەو کەسەی لە وڵاتەکەی خۆیدا ئەناسراوە، وەلی لە جیهاندا وەک دیارترین مێژوونووسی فەلسەفەی ئیسلامی، کە لە ژیاندا ماون، ناسراوە." هەروەها لەگەڵ

زۆرینەی بیروراکانیدا هاورا بووە، بەڵام لە بنچینەدا لێی جیاواز بووە، لەوەدا کە ئیبن خەلدوون لە تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکەیدا هەمان ئەو پرنسیپە لۆژیکییانەی پیادە کردووە، کە ئەفلاتوون و ئەرستۆ و فەیلەسووفە ئیسلامییە شوێنکەوتووەکانیان پیادەیان کردووە.

بەم شێوەیە، لەکاتێکدا موحسین مەهدی پێی وایە ئیبن خەلدوون جگە لە خوێندکارێکی بەوەفای فەیلەسووفانی پێشین، چیی دیکە نەبووە، بەتایبەت هیی ئیبن روشد، هەروەها زانستە نوێکەی لەسەر هەمان ئەو بنچینانە بوونیاد ناوە، کە ئەوان بیرکردنەوە فەلسەفییەکانی خۆیان لەسەر بوونیاد ناوە، بە جۆرێک، پێویستی بەوە نەبووە گۆرانکاری لەو بنچینانەدا بکات، یاخود گومان لە دروستییان بکات. وەردی پێی وایە، ئیبن خەلدوون تۆڵەسێن بووە لە فەلسەفەی دێرین بە شێوەیەکی گشتی و لۆژیکی ئەرستۆیی بە شێوەیەکی تایبەتی، بەڵگەش بۆ ئەمە، ئەوەیە ئەگەر ئەو، هەمان میتۆدی فەیلەسووفانی پێش خۆی پیادە کردبێت، "ئەوا نەیدەتوانی سەرکەوتوو ببێت لەوەی زانستێکی نوێمان بۆ بەرهەم بهێنێت." بە بۆچوونی وەردی، "ئەو داهێنانە مەزنەی ئیبن خەلدوون کردی، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە ئەم پیاوە توانیویەتی لە لۆژیکە کۆنەکە خۆی ئازاد بکات و لۆژیکێکی نوێ بگرێتە بەر." لێرەوە، بەرواڵەت پێویستیی کتێبەکەی دێت بە ناوی *"لۆژیکی ئیبن خەلدوون"* بەو پێیەی گرنگترین کارە لەم بوارەدا.

وەلی زوو درک بەوە دەکەین وەردی ئەم کتێبە بۆ خستنەرووی میتۆدە دیالێکتیکییەکەی بەکار دەهێنێت.

بە واتای ئەوەی وەردی لەمیانەیەوە پەنا دەباتە بەر سەربارکردنی لۆژیکی ئیبن خەلدوون لە بەرژەوەندیی خۆی. هەر وەک چۆن پەنابردنی خۆی بۆ کایەی فەلسەفە، وەک خستنەبری سەرنەکەوتنی دێت لەوەی نەیتوانیوە ئیبن خەلدوون پەلکێش بکاتە نێو کایەی کۆمەڵناسییەوە. بەم شێوەیە، بایەخی ئیبن خەلدوون لە سەردەمی نوێدا، زیاتر دەر دەکەوێت لەوەی ڕەخنە لە پرنسیپەکانی لۆژیکی کۆن بگرێت، لە ڕووی پراکتیزەکردنی بەسەر دیاردە کۆمەڵایەتی و ماددییەکانی ژیاندا بەتەنها، نەک بەسەر دیاردە ڕۆحی یان میتافیزیکییەکاندا. ئەم دیاردانەش ململانێ و هاودژی و گۆڕان لە خودی ژیانی کۆمەڵایەتیی واقیعیدا. هەر ئەمەش وا دەکات تێکشکاندنی لۆژیکی کۆن پێویست بێت.

بەدڵنیاییەوە عەلی وەردی کتێبەکەی، *لۆژیکی ئیبن خەلدوون*، بەتەنها تەرخان دەکات بۆ تیۆریی لۆژیک لای ئیبن خەلدوون، دوای ئەوەی وەک "مەزنترین بیریارەکانی جیهان" هەژماری دەکات و "زۆریش لە فەیلەسووفانی هاوچەرخ دەچێت" لەبەر دوو هۆکار، یەکەمیان ئەوەیە، ئەو یەکەمین کەس بووە بە ڕێگەیەکی واقیعی لە کۆمەڵگەی مرۆیی کۆڵیوەتەوە، دووەمیشیان، بە هۆی ئەوەی ڕەخنەگرتنی لە لۆژیکی ویندیی یان ئەرستۆیی، "ڕەخنەیەک نەبووە بە هۆی دەمارگیرییەوە، بەڵکوو بە هۆی بانگەشەکردنی بۆ لۆژیکێکی نوێ و هەماهەنگ لەگەڵ میتۆدی کۆمەڵایەتیی واقیعی و ڕاستییە مێژووییەکاندا."

بە بۆچوونی وەردی، بیریار تا زیاتر لە کۆتەکانی لۆژیکی

کۆن خۆی دەرباز بکات، زیاتر دامێنان لە بیرکردنەوەکانیدا دەکات، ئەوەی ئەم قسەیەش دەسەلمێنێت، ئەوەیە تەواوی زانستە نوێکان، بە سروشتی و کۆمەلایەتییەوە، "تا فرانسیس بیکۆن شۆرشە ناسراوەکەی بەسەر لۆژیکی ئەرستۆیی و کەلەپووری فەلسەفیی کۆندا ئەنجام نەدا، نەیانتوانی بەم شێوە سەرسوورهێنەرە گەشە بکات." لەبەر ئەوە، ئەم جارە ئەو شۆرش لە دژی چەمکی لۆژیکی تەقلیدی لە تێروانینی کۆمەلایەتی وەرگیراودا رادەگەیەنێت. لەوانەشە هەر ئەمە ئەو رەهەندە رەخنەییە و تەنانەت مشتومرییەش راڤە بکات، کە بەسەر زمان و شرۆڤەکردنەکانی وەردیدا زالە، بەتایبەت لەهەمبەر هەندێک لە توێژەرە هاوسەردەمەکانیەوە، یان ئەو بانگەشەکەرانەی بە پشتبەستن بەو "بیوانەکارییە لۆژیکییە کۆنانەی پێیانەوە دەهاتن و دەچوون، وەک چۆن جەنگاوەری بە شمشێرەکەیەوە دێت و دەچێت،" بێ ئەوەی درک بەوە بکەن، کە کۆمەلگە، وەک ئیبن خەلدوون بەئاشکرا دەلێت، "لۆژیکێکی دیکەی بۆ دەگێرێتەوە، جیاواز لەو لۆژیکەی کۆتایی."

بەلام کۆمەلگەی بەرجەستە، ئەو (گەردوون)ـەیە، کە بەلای وەردی و تیۆرە کۆمەلایەتییەکەیەوە بایەخدارە. ئەم گەردوونە، "گوزارشتە لە سیستمگەلێکی کارلێکردوو، لە پەیوەندی و بەرژەوەندی، کە لە گۆرانێکی بەردەوامدایە." -بە مانا تێرامانییەکەی وشەکە- هیچ بەرئەنجام و راستییەکی فەلسەفی بوونیان نییە، بەلکوو "هەلوێستگەلێک" یان "تەرزگەلێکی بیرکردنەوە"ی ژیانین، کە ئەو گۆرانە لەمیانەی ململانێی پەیوەندییەکان و بەرژەوەندییە

راستەقینەکانی کۆمەڵگەوە، دەریان دەدات. لێرەوە، ئەو ڕەخنە توندە لە فەیلەسووفە یۆنانییەکان دەگیرێت، بەوەی ئەو فەیلەسووفانەی "بەتەواو لە ژیان دابڕابوون" چونکە ئەوان "زۆر جار سەر بە چینی خانەدانە خاوەن کۆیلەکان بوون. ئەمەش بەتایبەت بەسەر ئەفلاتوون و ئەرستۆی خوێندکاریدا دەچەسپێت، کە لەسەر دەستی ئەو، لۆژیک هاتە ئارا." سەرەڕای ئەوەی وەردی نکوولی لە مەزنیی ئەو فەیلەسووفانە ناکات لە مێژووی هزری مرۆییدا، چونکە ئەوان یەکەم کەس بوون هزری مرۆییان لە قۆناغی "ئەفسانەیی جادووییەوە برد بەرەو قۆناغی لۆژیککەرایی ڕێکخراو." بەلام لەگەل ئەوەشدا ئیدانەیان دەکات، لەمیانەی ئەوانیشەوە ئیدانەی هاوشێوە مسولمانەکانیشیان دەکات، لەسەر ئەو بنچینەیەی "ڕێکخستنیان بۆ هزر، زیاتر ئایدیالیستی بووە وەک لەوەی واقیعی بێت، ئەوان لە ڕوویەکەوە سوودیان بە هزر گەیاندووە و لە ڕوویەکی دیکەشەوە زیانیان پێ گەیاندووە."

سۆفیستەکان، ئەو واقیعگەرا ئازادانە بوون، کە وەردی پەسەندیان دەکات و لە ئەفلاتوون و ئەرستۆ بەلایەوە باشترن. بە دۆڕاندنی جەنگەکەشیان دژی فەیلەسووفە خانەدانەکان، ئازار دەچێژێت. ئەو دۆڕاندنەی "بووە یەکێک لەو هۆکارانەی وایان کرد بیرکردنەوەی کۆمەلایەتیی واقیعی لە کەلەپووری فەلسەفەی دێریندا شتێکی دەگمەن بێت. فەلسەفەی دێرین بە هزرە ڕەهاکانی ئەودیو کۆمەلگە و ژیانەوە، سەرقال بووە. خۆ ئەگەر یەکێک لە فەیلەسووفەکان دابەزیبایە و سەیرێکی کاروباری

کۆمەڵگەی بکردایە، ئەوا لەمەدا لایەنێکی ئایدیالیستیی واعیزیی دەگرتە بەر، واتا سەیری ئەوەی دەکرد، کە (دەبێت چۆن بێت) نەک (ئێستا چۆنە)، وەک چۆن ئەفلاتوون لە *کۆمارەکە*یدا، یاخود فارابی لە *شاری چاک*[1]دا کردیان."

هەنووکە ئێمە لە بەردەم بەربەستی پاکتاوکردنی حیسابداین لەگەڵ خودی فەلسەفەی تێرامان (یاخود ئایدیالی)، کە بیریاری کۆمەڵایەتی لە هەموو کات و شوێنێکدا لەژێر بیانووی "مرۆڤ پێوەری حەقیقەتە"دا دەیشارێتەوە، لە ڕوویەکی دیکەوە، خۆی لە خۆیدا بەواتای کەمکردنەوەی پێویستبوونی وەک چالاکییەک، دێت. بەم شێوەیە، فارابی لە *شاری چاک*دا مەرجێکی پێویست بۆ بەرژەوەندیی شار و بەختەوەربوونی دادەنێت، ئەو مەرجەش، وەک وەردی دەڵێت، ئەوەیە "سەرکردەیەکی هەبێت، لە تایبەتمەندییە جیاوازەکانیدا کامل بێت." هەر بۆیە بەتووڕەییەوە دەپرسێت: "فارابی ئەم مەرجەی لەکوێوە هێناوە؟ سەرەتا ئەم مەرجەی ئەفراندووە و دواتر بیری خۆی پێوە شەتەک داوە، هەر بۆیە نەیتوانیوە لێی دەرباز ببێت. فارابی دەڵێت: شاری چاک وەک جەستەی تەندروست وایە، ئەندامی سەرەکی لە جەستەدا، دڵە، ئەگەر ئەو تەندروست بێت، ئەوا ئەندامەکانی دیکەش تەندروست دەبن، هەر بۆیە پێویستە لە شاری چاکیشدا، سەرۆکێکی چاکەکار هەبێت، ئەگەر نا، ئەوا شار بەرەو لەناوچوون دەچێت."

وەردی بە پێچەوانەی فارابییەوە چوواندنی شار بە جەستە ڕەت دەکاتەوە، هەروەها ئەوەش ڕەت دەکاتەوە،

---

١ شاری چاک: المدينة الفاضلة (و. ک.)

کە لە ڕێی بارودۆخە دیارەکانەوە دەلالەت لە ئاکاری ناوەوە بکات، وەک لای فەخرەدین ئەلڕازی هەیە، هەر وەک چۆن بەتەواوەتییش لۆژیکی وێنەیی ئەرستۆیی ڕەت دەکاتەوە، بەڵام سەبارەت بە لۆژیکی دیالێکتیکی، شتێکی دیکە دەڵێت: "هەندێک جار لۆژیکی دێرین بەوە وەسف دەکرێت، کە (لۆژیکی کەینوونە)یە، ئەمەش بە بەراورد بە لۆژیکی زانستیی نوێ، بە (لۆژیکی بزاوت) وەسف دەکرێت، تەواوی گەردوون، بە دیاردە جیاوازەکانیەوە، وا سەیر دەکرێت کە لە بزاوتێکی بەردەوامدایە. ئێمەش ناتوانین بە شێوەیەکی واقیعی لە شتەکان تێبگەین، ئەگەر لە ڕوانگەیەکی بزاوت و گۆڕانەوە سەیریان نەکەین.

وەلێ پێویست بوو چاوەڕێی ئیبن خەلدوون بکەین، تا بگەینە (لۆژیکی بزاوت)، کە بۆ داڕشتنی پێویستی بە ڕێگوزەرێکی ئاڵۆز و دووروودرێژ هەبوو لە ململانێ و بەلکوو لە جەنگان لەنێو مێژووی فەلسەفەی ئیسلامییشدا، بە گومانگەرا مسوڵمانەکان دەستی پێ کرد، ئەوانەی گاڵتەیان بە لۆژیکی ئەرستۆیی دەکرد، بەو پێیەی ئامرازێکە بۆ خاوبوونەوەی موژدەبەرەکان، بەوەی "هەرشتێک بە دیالۆگ بچەسپێت، هەر بە دیالۆگیش ڕەت دەکرێتەوە." پاشان جاحیز هات، بە تیۆرەکەیەوە دەربارەی سنووردارێی عەقڵ لە تێهزرینی حەقیقەتە دەرەکییەکان و بینینیان بە شێوەیەکی تەواو دروست، لەوە نزیک بووە بڵێت: "مەعریفە کۆمەڵایەتییە." پاشان غەزالی دەر کەوت و دەیوت، بەڵگەی لۆژیکی لە پرسە خودایی و ڕۆحییەکاندا، ناتوانێت مرۆڤ بگەیەنێتە یەقین، بەمەش، تکوولیی لە پرنسیپی عەقڵانییەت

و هۆکارمەندی دەکرد. لە کۆتاییشدا، ئیبن تەیمیە هات بە رەوتەکەیەوە، کە هەڵوەشاندنەوەی لۆژیک، واتا هەڵوەشاندنەوەی ئەو بنەچەیەی هەڵێنجانی لۆژیکی و پێوانەکاری لەسەر دادەمەزرێت، پاشانیش گومانکردن لە دروستیی هەمووەکییە عەقلییە گشتییەکان، لەسەر بنەمای ئەوەی پێویست نین و بوونێکی دەرەکی بەدیهییان نییە، بەڵکوو تەنها لە زیهن دان و زانستیش حەقە، پاشانیش هەر ئەو راستییەکانی لە شتە بەشەکییە دیاریکراوەکانەوە وەر دەگرێت، نەک لە گشتە زیهنییەکانەوە، ئەمەش وا لە ئیبن تەیمیە دەکات، لە روانگەی وەردییەوە لەمەدا لە فرانسیس بیکۆن و جۆن ستیوارد میل بچێت، چونکە ئەویش شوێنگەلە زیهنییەکان و شوێنگەلە دەرەکییەکان لێکدی جودا دەکاتەوە.

لەکۆتاییدا، ئەم چوار بەدەستهێنراوە دیالێکتیکییانە، بەرەو ئەوە رۆیشتن مەعریفەی مرۆیی دابەش بکەن بۆ: رۆحی و سروشتی، کە هیچکامیان پێویستیان بە لۆژیک و پێوانەکاریی لۆژیکی نییە، چونکە ئەوەی یەکەمیان ئایین سەرچاوەیەتی و ئەوەی دووەمیشیان ئەزموونییە و پەیوەستە بە واقیعی بەشەکییەوە، زیاتر لەوەی پێوانەیی یاخود هەڵێنجانی بێت. بەم لێکجیاکردنەوەیە، میتۆدی هەڵێنجانی واقیعیی دامەزرا، کە بە شێوەیەکی پەرەسەندووتر لای ئیبن خەلدوون بەدی دەکرێت، بەمەش لە دامەزراندنی میتۆدی پۆزەتیڤیزمی هەڵێنجانی لە کۆمەڵناسیدا، پێش ئۆگست کۆنت کەوتووە.

**لە فەلسەفەوە بۆ کۆمەڵناسی:**

ڕووکردنە ماڵی فەلسەفە لەلایەن وەردییەوە، دوای ئاشنابوونی بە ئیبن خەلدوون، دووڵیی پێوە دیار بوو و دەرەکی بوو و زۆر بوی نەکرد. ئەمەش پاشەکشە و هەوڵدانی ڕاڵە دەکات بۆ پەلکێشکردنی ئیبن خەلدوون بۆ نێو کایەی کۆمەڵناسی، تەنانەت لەگەڵیدا هەریەک لە ڤیکۆ و مۆنتسکیۆ و هیگڵ و مارکسیش پەلکێش دەکات و بە (ڕابەرانی کۆمەڵناسی لە سەردەمی نوێدا)، کە دوای ئیبن خەلدوون دێن، وەسفیان دەکات. بە ڕای وەردی، پێویستە لە کۆمەڵناسیی خەلدوونی بکۆڵینەوە، نەک لە ڕووی میتۆدیی قووڵەوە، وەک لە زانستە دێرینەکانی وەک پزیشکی ڕازی و ئەستێرەناسی توسی و کیمیای جابری کوڕی حەییان دەکۆڵینەوە، "بەڵکوو لە ڕووی پراکتیکییەوە، لەم سەردەمەدا سوودمان پێ دەگەیەنێت، بەتایبەت لە لێکۆڵینەوەی ئەم کۆمەڵگەیەی ئێستاماندا. ئەگەر ئێمە دۆخی کۆمەڵگەی عەرەبی لە سەردەمی ئیبن خەلدووندا بەراورد بکەین بە دۆخی ئەمڕۆمان، لەیەکچوونێکی گەورە بەدی دەکەین." بەو پێیەی ئەو ململانێی بەردەوامەی لەنێوان سارانشینی (کۆمەڵگەی جووڵاو) و شارستانیەت (کۆمەڵگەی وەستاو)دا هەیە، تەوەری سەرەکیی تیۆریی خەلدوونییە.

گرفتەکە لێرەدا، تەنها پەلکێشکردنی ئیبن خەلدوون نییە لە فەلسەفەوە بۆ کۆمەڵناسی، بەڵکوو دیاریکردنی ئەرکێکی سوودگەرای بەرجەستەیە بۆ میتۆدەکەی، ئەمەش

بە شێوەیەکی ناچارەکی بووە هۆی خامۆشکردنی پشکۆی مشتومڕی خەلدوونی، کە ئەمەش لە هزری کۆمەڵایەتیی عەلی وەردیدا ڕەنگی دایەوە. بەلای ئێمەوە، چەمکی ململانێی سارانشینی و شارستانیەت لای وەردی، زۆرێک لەو وزە گراوەیەی لەدەست داوە بەرامبەر ئەو داهاتووەی لە خوردی ڕەسانایەتیی خەلدوونیدا بەدی دەکەین. بە هەرحال، نابێت پێمان وا بێت ئیبن خەلدوون (هەروەها ڤیکۆ و مۆنتسکیۆ و هیگل و مارکس)، تەنها لە کۆمەڵناسیدا پێشەوایە، لە کاتێکدا ئەو زیاتر لەوە نزیکە فەیلەسووفی مێژوو بێت وەک لە هەرشتێکی دیکە. ئەو یەکەم کەس بووە بانگەشەی ئەوەی کرد، وەک لقێک لە لقەکانی فەلسەفە لە مێژوو بکۆڵرێتەوە، پاشانیش دامەزرێنەری (فەلسەفەی مێژوو)ە، کە هۆشیاری چییەتیی شارستانیەتی مرۆییە وەک گشت و وەک یەک یەکە، کە لە گۆڕانە زەمەنییە بەرجەستەکەیەوە وەر گیراوە و لە دەرەوەی ویستی ڕاستەوخۆی تاکەکان و گرووپەکانەوە هاتۆتە ئارا. بابەتەکەش دیاری دەکەین بەوەی هۆشیاریی، جەوهەری گۆڕانە و مەبەستەکەشیەتی، نە تەنها لە بواری کۆمەڵناسیدا، بەڵکوو لە تەواوی بوارەکانی دیکەشدا.

بەکورتی، هزری تیۆریی خەلدوونی، بەلای ئێمەوە، هزرێکی مێژووییە لە ناواخن و ڕوانگەوە، سەرەرای ئەو پێدراوە دەوڵەمەند و ڕەسەنانەی لەخۆیان دەگرێت لە کایەکانی تایبەت بە زانستە کۆمەڵایەتییەکان و سیاسی و ئابووری. ئیبن خەلدوون، بەر لە هەرشتێکی دیکە، مێژوونووسە، بیری لە ڕابردوو کردۆتەوە، بەتایبەتیش ڕابردووی مێژوویی. ئەم بیرکردنەوەیەش لە مێژوو، لەسەر

زەمینەیەکی لاهووتی دانەمەزراوە، وەک لای قەشە ئۆگستین بە نموونە بەدیی دەکەین، هەروەها لەسەر زەمینەیەکی سیاسی-ئایدیۆلۆژییش دانەمەزراوە، وەک لای مۆنتسکیۆ بەدیی دەکەین، هەروەها لەسەر زەمینەیەکی کۆمەڵایەتیی رووتیش دانەمەزراوە، وەک لای عەلی وەردی بەدیی دەکەین، بەڵکوو لەسەر بنەماگەلێکی فەلسەفیی دیالێکتیکی دامەزراوە، وەک لای ئەرستۆ یان ئیبن روشد یاخود هیگڵ و چەند کەسێکی دیکە بەدیی دەکەین. راستە ئیبن خەلدوون وەک ئەوانی دیکە فەیلەسووفێکی (پیشەگەر) - ئەگەر گونجاو بێت وا بڵێین - نەبووە، بەڵکوو ئەو تەنها مێژوونووسێکی فەلسەفێنەر بووە. لەگەڵ ئەوەشدا، کورتەی هزرە تایبەتییەکانی دەربارەی مێژوو، بە شێوەیەکی پێویست خۆی دەسەپێنێت، بەوەی بەتەواوی وەک تیۆرێک لە مێژووی فەلسەفەدا وەری دەگرێت، نەک لە کۆمەڵناسیدا، بەتایبەت کە هەوڵ دەدات لە مامەڵەکردنی لەگەڵ مێژوو، بەئاشکرا وەک لقێک لە لقەکانی فەلسەفە دیاری بکات.

گومانی تێدا نییە، هزرەکانی ئیبن خەلدوون لە *المقدمة*دا تایبەتن، گەلێک لەو بەئەنجامگەیشتن و وێناکردنانە دەگرنە خۆیان، کە رێگە بەوە دەدەن وەک دامەزرێنەری کۆمەڵناسیی هاوچەرخ هەژمار بکرێت، وەک جەختکردنەوەیەکیش لەسەر ئەم بابەتە لە *المقدمة*دا هاتووە: "حەقیقەتی مێژوو، کرۆکی کۆبوونەوەی مرۆییە، کە ئەویش ئاوەدانکاریی جیهانە، ئەو دۆخانەشی سروشتی ئەم ئاوەدانکارییە دەخەنە روو، پێکدێن لە: درندەیی، هۆگری، دەمارگیری و جۆرەکانی زاڵبوونی هەندێک خەڵک بەسەر هەندێکی دیکەدا، لەمەشەوە

پادشا و دەولەت و پلە و پۆستەکانی دیکە دروست دەبن، خەلکیش کار دەکەن و هەول دەدەن گوزەرانیان دابین بکەن و سەرقالی زانستەکان و پیشەکان دەبن، تەواوی ئەوەی لەم ئاوەدانکارییەدا روو دەدات." چەند توێژەر و خۆرهەلاتناسێک دوودل نەبوون لەوەی دان بەمەدا بنێن، هەندێکیان بەرەو ئەوە ملیان ناوە، خاوەنی *المقدمة*، وەک دامەزرێنەری راستەقینەی قوتابخانەی پۆزەتیڤیزم لە کۆمەلناسیدا هەژمار بکەن، کە زۆر جار ئۆگست کۆنت بە دامەزرێنەری هەژمار دەکرێت، یاخود دەیکەن بە رابەری مەکیاڤیلیزم بەر لە مەکیاڤیلی. لە کاتێکدا هەندێکی دیکەیان ئیبن خەلدوون وەک دامەزرێنەری تیۆریی ماتریالیزمی مێژوویی هەژمار دەکەن، بەوپێیەی لەپێش مارکسەوە بووە. بەلام ئەم بۆچوونانە، سەرەرای پتەوییان و ئەو زەمینە زانستییانەی لەسەری دامەزراون و پشتیان پێ دەبەستن، بە بۆچوونی ئێمە، چەند گومانێکی ئالۆز دەورووژێنن، کە ناتوانرێت بەتەواوەتی و بە شێوەیەکی بنەبڕ چارەسەر بکرێن. هەر وەک چۆن مامەلەکردنی هەلبژێردراوی تایبەت بە وەردی لەگەل ئیبن خەلدووندا، لە تەواوی ئەو تێروانینانەیدا کە باسکران، روون نییە و تێگەیشتنی زەحمەتە، هەر لە ئەنجامە راستەوخۆکانیەوە، تا ئەوەی لۆژیکی وەردی لە رووالەتدا جێی مشتومرە، نە تەنها ئەمە، بەلکوو بە هۆی دووریی گەردوونی و رۆحییەوە لێی، ئاسۆکانی داخراون و خاوەن هیچ دینامیکیەتێکی خۆکردی نییە.

## وەردی و دیالێکتیکی هیگڵی:

هاوشان لەگەڵ گرفتی لۆژیکیی دیالیکتیکی بنبەست، میتۆدی دیالیکتیکی لای عەلی وەردی کێشەیەکی دیکەش دەخاتە ڕوو، ئەویش وەستانیەتی لەسەر پێدراوی خەلدوونی بەتەنها. ئەمە جێگەی سەرسووڕمانە – لە کاتێکدا ئەو خاوەن هزرێکی ئازادە – لە ڕووی پراکتیکییەوە، بایەخی بە هزری دیالێکتیکی نەداوە لای مارکس بە نموونە، هەرچەندە سەرسام بووە بە هزری چەپ، یاخود بەتایبەت لای هیگل، وەک ئاماژەمان پێ دا، بە مەزنترین فەیلەسووفی لۆژیکیی بزاوتی دادەنێت.

بە هەرحاڵ، بە ڕای ئێمە بایەخدانێکی قووڵی ڕەخنەیی بە فەلسەفەی هیگل، بەتایبەت بە هەردوو چەمکی فەلسەفەی مێژوو و دیالێکتیکییەکەی، دەستەبەری ئەوەی دەکرد، تیۆریی وەردی دەوڵەمەندتر بکات، تەنانەت لەو بەشەشیدا کە تایبەتە بە کۆمەڵگەی عێراقی، بەڵکوو هەندێک لە لایەنە چەقبەستووەکانی دیالێکتیکییەکەشی باشتر دەکرد، بەڵام ئەوەی لە هەموو ئەمانە گرنگترە، ئەگەر وەردی بایەخی بە هیگڵ بدایە، ئەوا هزری وەردی سەبارەت بە بلیمەتی بیرینەی ئیبن خەلدوون و هزرەکەی، دەوڵەمەندتر دەکرد، وەک لە چەند لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفیی چاپکراوماندا ڕوونمان کردۆتەوە بە ناوی *مێژووی دەوڵەت لەنێوان ئیبن خەلدوون و هیگڵدا*، چەندین لێکتزیکی سەیر لەنێوان (وانەکان)ی مێژووی هیگلیزم و (پەندەکان)ی خەلدوونیزمدا هەیە، تەنها لە بڕیاردانی عەقڵ لە خوێندنەوەی گۆڕانی فیعلی مێژووی مرۆڤایەتی و لە بەربەستی گشتگیری و بابەتگەریی ڕەخنەیی لە

مامەڵەکردن لەگەڵ دیاردەکانیدا و لەو ناوەندیتییە گەورەیەی چەمکی بازنەیی لە راڤەکردنی مێژوودا لای هەریەکەیاندا کورت نابێتەوە، بەڵکوو پێمان وایە ئەم لێکنزیکییە تەنانەت لە بنەماکانی میتۆدی دیالێکتیکی و لەو بزاوتی ناوخۆییەشدا بەدی دەکەین، کە لای ئەوان کاری تێ دەکەن.

پێناسەی هیگل بۆ (فەلسەفەی مێژوو) لەرووی ناوەرۆکەوە، دوور نییە لە پێناسەی ئیبن خەلدوون، کە بە (زانستە نوێکە) ناوی دەبات، تەنانەت لە یەکیش دەچن. ئەم لەیەکچوونە، یەکەمیان لەوەدا رەنگ دەداتەوە، کە مانای مێژوو ئاوەدانکاری مرۆییە، لە تەواوی لایەنەکانیەوە و لە چوارچێوەی زەمەنە زەمینییەکەشیەوە. بەو مانا گشتییەی چەمکی (کاری بوونەوەران)ی خەلدوونی دەیدا بەدەستەوە. دووەمیشیان لەوەدا رەنگ دەداتەوە، کە مێژوو لەگەڵ پەیدابوونی مرۆڤ لە سروشتدا دەست پێ ناکات، بەڵکوو تەنها ئەو کاتە دەست پێ دەکات، کە مرۆڤ لەگەڵ هاورەگەزەکانیدا پەیوەندی دەبەستێت، ئەم پەیوەندییەش لەسەر بنەمای پێویستیی هاوبەش بۆ رێکخستنی کۆبوونەوەی مرۆیی (ئاوەدانکاری مرۆیی) دادەمەزرێت، نەک تەنها لەسەر بنەمای پەیوەستیی خوێنی، یان دووبارەبەرهەمهێنانەوەی چەشن لە بیابان و جەنگەڵەکاندا. سێیەمیش ئەو پرۆژەیەی بەلای فەلسەفەی مێژووی هیگلییەوە بایەخدارە، دۆزینەوەی ئەو چییەتییە قووڵ و شاراوەیە، کە ئەو شارستانیەتەی لەسەر دادەمەزرێت، واتا دۆزینەوەی ئەوەی ئیبن خەلدوون بە (باوکی مێژوو) ناوی دەبات، لە کاتێکدا هیگل بە (ناواخنی مێژوو) ناوی دەبات.

سەبارەت بە دیالێکتیکی هیگڵی، لە زۆر بوارەوە دیالێکتیکی خەلدوونی تێدەپەڕێنێت، سەرەرای ئەو بایەخە گەورەیەی ناوەندگیریی بابەتی ململانێ یاخود هاودژی لە هزری ئیبن خەلدووندا و بایەخی ئەوەی لەم بزاوتەوە بەرهەم دێت، لە پێدراوی نوێ لە مێژوودا، لەسەر هەردوو ئاستی دەوڵەت و مەعریفە و تەواوی لایەنەکانی دیکەی ئاوەدانکاریی مرۆیی. راستە "بابەتی دیالێکتیکی ژیان و مردن، بە یەکبوون و هاودژییانەوە، هەروەها پەیوەستیی بەهێزیان بە پەرەسەندنی بوونەوەرەوە، هەر لە لەدایکبوونییەوە تا کۆتاییەکەی، پێگەیەکی گەورەی لە چەمکەکانی ئیبن خەلدووندا گرتووە، بە پلەیەک، مرۆ ناتوانێت جگە لە مۆرکێکی دیالێکتیکی لای ئەو، چیی دیکەی پێ ببەخشێت." وەک توێژەری فەرەنسی، ئیڤ لاکوست دەڵێت. ئەوە نەبێت میتۆدی دیالێکتیکی خەلدوونی زۆر سنووردارە، هەروەها مەحکوومە بە پرنسیپی هۆکارمەندی لە لایەک و سەرپێیی و دەرەکی - ئەگەر دەربڕینەکە شیاو بێت - لە لایەکی دیکەوە. بەڵکوو ئەو بەشەی لە//مقدمة‌دا بۆ چەمکی دیالێکتیک تەرخان کراوە، بە بەراورد بە مۆرکی قووڵی بەشە تیۆرییەکانی دیکە، زۆر ساکار دەر دەکەوێت.

وەلێ لای هیگل، میتۆدی دیالێکتیکیی وەک بڕبڕە و دڵی زیندووی تەواوی سیستمە فەلسەفییەکەی دەردەکەوێت، لە تەواوی لایەنەکانییەوە، مێژوویی و نامێژووییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا، لەوەیە هیگل لە بابەتی مێژوودا، دیالێکتیکی خەلدوونی وەرگرتبێت، چونکە ئیبن لەدوون یەکەم کەس بووە هاودژی و تێکەتیڤی کردووە بە سەرچاوەی پێشکەوتن و ئاوەدانکاری.

یەکێکی دیکە لەو چەمکانەی بە شێوەیەکی تایبەتی بۆ وەردی پربایەخە، بە هۆی پەیوەندیی بە میتۆدە کۆمەڵایەتییەکەیەوە، سەرباری لەیەکچوونی لەگەڵ هزرەکانی ئیبن خەلدووندا. لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەتی ئاماژە بە رۆڵی دەمارگیری دەکەین لە ئاوەدانکاریی مرۆییدا، لەگەڵ پرنسیپی ململانێی سارانشینی و شارستانیەت لە کۆمەڵگەدا، هەروەها هۆکارەکانی دروستبوونی دەوڵەت و قۆناغە سروشتییەکانی دەوڵەت و... تا دوایی.

سەبارەت بە دەمارگیری، ئاشکرایە کۆرپەلەی دەوڵەت لای ئیبن خەلدوون، زۆر بەروونی لە چوارچێوەی ئاوەدانکاریی سارانشینیدا دیارە، بەرەبەرەش لەناو ململانێی خێڵەکان و یەکدیکوشتنیان لەپێناو مانەوەدا گەشە دەکات، بەڵام دەمارگیری لەدایک نابێت، تاکوو خێڵێکی گەورە، یاخود چەند خێڵێکی هاوپەیمان هێرش نەکەنە سەر ناوەندێکی شارستانی و بەزۆر و لە رێی جەنگەوە دەستی بەسەردا نەگرن. ئەم یەکێتییەش بە شێوەیەکی سروشتی و بە هۆی پەیوەندیی خوێن و رەچەڵەکەوە بوونی هەیە، بەڵام لە مێژوودا دەر نەکەوتووە، تەنها ئەو کاتە نەبێت، کە دەگۆڕێت بۆ وزەیەک و هەڵپە دەکاتە دەرەوەی کیانەکەی خۆی. ئەمەیە ئیبن خەلدوون بە (دەمارگیری) ناوی دەبات، ئەویش حاڵەتێکە، لە گیانی بەکۆمەڵ و هێزێکی ناکاری نییە، وەک (چاکەکاری) لای مەکیاڤیلی، هەروەک چۆن پەیوەستییەکی ئێتنیش نییە، وەک (خوێنی پاک) لای گۆبینۆ، لە کۆتاییشدا، پەیوەستیی بەرژەوەندیی کۆمەڵایەتی یان ئابووری، خودی راستەوخۆ نییە، وەک (دانەپاڵی چینایەتی) لای مارکس، بەڵکوو پەیوەستیی

ڕەچەڵەکە بە مانا فراوان و تەنانەت مەجازییەکەشیەوە، چونکە ڕەچەڵەک لای ئیبن خەلدوون، لە ڕاستیدا تەنها لە دانەپاڵی نەتەوەییەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکوو لەو پەیوەندییە ڕاستەوخۆیانەشەوە سەرچاوە دەگرێت، کە پێداویستی و پێداوەکانی کۆبوونەوەی مرۆیی دەیسەپێنن، واتا بەو پەیوەندییەی بەرژەوەندیی گشتی بەسەر گرووپیدا دەسەپێنێت، لە ساتی هەڵپەکردنیان بۆ دەستگرتن بەسەر دەستکەوتی مەدەنیدا.

خودی ئەم ڕەگەزانەش لای هیگل، فاکتەری سەرەکین بۆ دەرکەوتنی دەوڵەت، چونکە یەکەمین دەرکەوتنی دەوڵەت لای هیگل لەو ساتەدا کورت دەبێتەوە، کە هاودژییەکانی (بوونیادی خێزان) دەگەنە خاڵێک، تەقنەوەی شتێکی حەتمییە، لە ڕێی هەڵپەکردنیەوە بۆ دەرەوە، گوزارشت لە خۆی دەکات، ئەمەش بە شێوەیەکی سەرنجڕاکێش لەو هەڵپە خێڵەکییە سارانشینییە دەچێت، کە لای ئیبن خەلدوون هەیە بۆ دەستخستنی شارستانیەت. ئەوەی ئەم سەرنجڕاکێشییەش زیاتر دەکات، دەشێ ئەوە بێت کە هیگل خێڵەکی سارانشینیی عەرەبی، بەدیاریکراوی، وەک گرووپی مرۆییی سەرەتایی هەژمار دەکات، کە دەبنە بلاچەی بزووتنەوەی لەدایکبوونی دەوڵەت. هەر بەڕاستییش خێڵە سارانشینە عەرەبییەکان و تەتەرەکان، لای هیگل، لە بنەڕەتدا نەتەوەگەلی سەرلێشێواو و ناجێگری سروشتین و پرنسیپێکی ڕۆحیی سەرپێیی بەڕێوەیان دەبات، کە دەیانخاتە دەرەوەی مێژووەوە، چونکە بەو ژیانە سادەوساکارەی بیابان ڕازین، بەڵام بێ ئەوەی پەرە بە خۆیان بدەن بۆ ئەوەی بگەنە پلەی مێژوو. ئەم

گەلانە هێزێکی هەڵپەکارییان هەیە، کە بە هۆیەوە دەتوانن ڕووکاری خۆیان بگۆڕن: "ئەوەی تایبەتە بەوان، ژیانە سەرلێشێواوە ناواقیعییەکەیانە، کاتێکیش بەدڵنیاییەوە بەڕێوە ناچێت، دەتوانرێت بگۆڕدرێت بۆ کاری تاڵانکاری، هەندێک جاریش لە شێوەی گرووپی گەورەدا کۆ دەبنەوە و هێرش دەکەنە سەر دەستەکان."

وەلێ زۆر جار ئەم هێرشانە، لە شێوەیەکی سەرەتایی دەوڵەتدا بەرجەستە دەبن و بەخێرایی پەرە دەستێنێت، پاشان سیماکانی هەمان ئەو دەوڵەتە شارستانییە وەر دەگرێت، کە داگیرکەران وێرانیان کرد. هیگل پێی وایە بوونیادی ئەم بەکۆمەڵبوونە جووڵاوە، دوای بوونیادی پاتریارکی دێت، "بەڵام خۆی بەرەو جەنگ و داگیرکاریی نێوخۆیی دەبات، هەروەها هێرشی دوژمنکارانەش دەکاتە سەر گەلانی دیکە، لە سەرەتادا سەرکەوتووان، ژێرکەوتووان ملکەچی خۆیان دەکەن، دواتریش لەگەڵیاندا تێکەڵ دەبن." وەلێ ئەم کۆمەڵانە، ناگەنە قۆناغی پەرەسەندن و بەشارستانیبوونی کردەیی، چونکە "تا لەو دەشتانەدا سەقامگیر نەبن کە داگیریان کردوون، بەمەش مۆرکە تایبەتییەکەیان لەدەست دەدەن، شارستانیەت بەدەست ناهێنن، بەڵام داگیرکارییەکان ئەوکات چەند بزاوتێکی بەرفراوانیان هێناوەتە ئارا و بوونەتە هۆی وێرانکاری و هەڵگەڕانەوە لە شێوەی دەرەکیی جیهاندا."

بەم شێوەیە، چەمکی (دەمارگیری) لە هزری هیگلدا (بوونیادی پاتریارکی) دەگرێتە خۆی، کە تایبەتە بەو پێکهاتە خێڵەکییە سارانشینییە عەرەبی یان مەغۆلانەی شارستانێتییەکان داگیر دەکەن". بەڵام خودی ئەو بوونیادە،

بە شێوەیەکی بەهێزتر و دەوڵەمەندتر لە چەمکی (ڕۆحی گەل-Volksgeist)دا جەختی لێ دەکاتەوە، کە بە یەکێک لە بنەما جەوهەرییەکانی فەلسەفەی هیگلی هەژمار دەکرێت، دەربارەی دەوڵەت و تەواوی مێژووی گەردوونی. (ڕۆحی گەل) خۆی لەوەدا دەبینێتەوە ئەوەی لەنێوان تاکەکاندا هەیە، هەمان ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان بەشەکان و کلێتدا هەیە، ئەویش جەوهەرەکەیانە. کەواتە ڕۆحی کۆمەڵ، بەپێی پرنسیپە تایبەتییەکەی خۆی و ئەو ئەرکە مێژووییەی لەلایەن ڕۆحی ڕەهاوە خراوەتە ئەستۆی، تەواوی دیاردەکانی ژیان و چالاکیی ئەو گەلە دەگرێتە خۆ.

لەسەر ئاستی مێژووی ڕاستەقینەی دەوڵەتیش، لەیەکچوونێکی سەرسووڕهێنەر لەنێوان تێڕوانینی هیگل و ئیبن خەلدووندا هەیە، بەتایبەت لە ڕووی بەدوایەکداهاتنی قۆناغە سروشتییەکانی ژیانی دەوڵەتان. هەردووکیان پێیان وایە دەوڵەت هاوشێوەی بوونەوەری زیندوو، لەدایک دەبێت و گەشە دەکات، پاشانیش پیر دەبێت و دەمرێت، مێژووش زنجیرەیەکی یەکلەدوایەکی دەوڵەتانە، هەریەکەیان بە بازنەیەکی پەرەسەندندا دەڕوات، کە چەند قۆناغێکی یەکلەدواییەکی حەتمی لەخۆ دەگرێت. کەواتە قۆناغەکانی ژیانی دەوڵەت لە ڕوانگەی هیگلەوە، لەم چوار قۆناغەدا کورت دەبنەوە: قۆناغی لەدایکبوونی دەوڵەت و دەستبەکاربوونی. قۆناغی گەنجێتی و پیاوەتی، تیایدا دەوڵەت هەژموون و گەشەکردن و تەواوی سەرکەوتنەکانی دیکە بەدەست دەهێنێت. قۆناغی پەککەوتەیی و پیری، لەم قۆناغەدا دەوڵەت ئەو چالاکییەی پێشووتر هەیبوو لەدەستی دەدات، هەروەها

کۆتاییی هێزە مێژووییەکەشی دەست پێ دەکات، وەک پێویستییەک بۆ سەرهەڵدانی دەوڵەتێکی نوێ، کە هەڵگری پرنسیپێکی باڵاترە و لەژێر سەرکردایەتییەکی نەتەوەییی مێژووییی نوێشدایە، لە کۆتاییشدا قۆناغی چارەنووسی کارەساتبار، مردن و لەناوچوونی دەوڵەتە.

لە لایەکی دیکەوە، بەدواییەکداهاتنی قۆناغە سروشتییەکانی دەوڵەت لای هیگل، تا رادەیەک هەمان ئەوەی ئیبن خەلدوونە، پەیوەست نییە بە بەدواییەکداهاتنی زنجیرەیەک قۆناغی کۆمەڵایەتی، یان سیاسی، یاخود تەرزی شارستانی، بەڵکوو بەدواییەکداهاتنی ئاستکەلێکە لە هێزی پەیوەستی بەکۆمەڵ، کە بە هۆیەوە دەوڵەت دروست دەبێت. هەر وەک چۆن پەیوەستییشە بە پلەی بەهێزی (دەمارگیری)یەوە لای ئیبن خەلدوون، بەڵام لای هیگل، پەیوەستە بە دۆخی (رۆحی گەل)ـەوە، هەروەها هەردووکیان هاوڕان لەسەر ئەوەی دارمانی دەوڵەتێک، بەدڵنیاییەوە دەبێتە هۆی دروستبوونی دەوڵەتێکی نوێ، هەروەها دارمانی دەوڵەت و ئیمپراتۆرییەکان، سەرپێیی نییە، بەڵکوو بەرئەنجامێکی حەتمیی خودی لۆژیکی پەرەسەندنە.

لە کۆتاییدا، گرنگترین لایەنی پەیوەندیی نێوان هیگل و ئیبن خەلدوون لە چەمکی درندایەتیی سارانشینیی دایە، مشتومڕێکی فراوان دەربارەی جەختکردنەوەکانی ئیبن خەلدوون هاتە ئارا، لەسەر ئەوەی دەیوت، "ئەگەر عەرەبەکان هەرشوێنێک داگیر بکەن، بەزوویی وێرانکاری روو لەو شوێنە دەکات، هۆکاری ئەمەش، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی عەرەبەکان نەتەوەیەکی درندەن... سروشتی بوونیشیان

دژی بوونیادنانە، کە بنەمای ئاوەدانکارییە." یاخود، "ئەوان بەو سروشتە درندەیەی تیایاندایە، خەڵکێکی تاڵانچی و خراپەکارن." هەندێک جاریش ئەم بۆچوونەی گشتگیرتر دەکات، تا تورک و تەتەر و تەواوی ئەو گروپە خێڵەکییە گەورانەش بگرێتەوە، کە خاوەن (ئاوەدانکاریی سارانشین)ن.

هەمان ئەم بۆچوونانە لای هیگلیش بەدی دەکەین، لای هیگل، عەرەب و تورک و تەتەر "بە هۆی داگیرکارییەکانەوە توانیویانە هەژموون و سەروەت و سامان، هەروەها مافی خێزانی خاوەندار لە هەژموون و پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکاندا بەدەست بهێنن، بەڵام هەموو ئەمانە تێپەڕ بوون و لەسەر لم بوونیاد نرابوون، چونکە ئەمڕۆ بوونیاد دەنرێت و سبەینێ دەڕمێت." ئەم گەلە سارانشینانە گوێ بە بوونیادنانی دەوڵەت، یان شارستانیەت نادەن، سەرەڕای ئەو هەموو هەڵچوون و هێزەی هەیانە، ئەوەی لە بنەڕەتدا بایەخی پێ دەدەن، تاڵانکاری و ملکەچکردنی گەلە شارستانییەکانە، لەدوای خۆشیانەوە، جگە لە (وێرانکاری و کاولکاری)، چیی دیکە جێ ناهێڵن.

ئاشکرایە تەواوی ئەم چەمکانە لە تیۆرەکەی عەلی وەردیدا دەربارەی کۆمەڵگەی عێراقیی نوێ، بەدی دەکەین، وەلێ بە دارشتەیەکی خەلدوونی، یان نزیک لێیەوە، بەڵام ئەو پێداگرییە میتۆدییەی لە دیالێکتیکیی هیگل و تەنانەت ئەو میتۆدگەراییەی لە دەستپێکی لۆژیکیی خەلدوونیدا هەیە، لای وەردی بوونیان نییە.

بۆ نموونە، چەمکی دەمارگیریی خەلدوونی لای عەلی وەردی بەدی دەکەین، بەڵام بە شێوەیەکی سەرپێیی، لە کتێبەکەیدا، *لێکۆڵینەوەیەک لە سروشتی کۆمەڵگەی عێراق*،

کە ساڵی ٢٠٠٧ چاپ کراوەتەوە، وەردی بۆچوونی خۆی لەسەر یەکێک لە ڕووکارەکانی (دەمارگیری) دەخاتە ڕوو، لەمیانەی گێڕانەوەی ئەم ڕووداوەوە، "ساڵی ١٩٣٩، لە کاتێکدا لەگەڵ هاوڕێکانمدا سەفەرم دەکرد بۆ بابل، لە شەمەندەفەرەکەدا یەکێک لە هاوڕێکانم لەگەڵ سەربازێکدا بەگژ یەکدا چوون و هاوڕێکەم زللەیەکی لە سەربازەکە دا. لە بەدبەختی ئێمەش، شەمەندەفەرەکە پڕ بوو لە سەرباز. هەواڵەکە لەنێویاندا بڵاو بووە و ئەوانیش کۆ بوونەوە و دەیانویست تۆڵەی هاوڕێکەیان بکەنەوە. هەموو سەربازێک، بێ جیاوازی، بەدوای خوێندکارێکدا دەگەڕا، تا لێی بدات. بەڵام لە دواساتدا بەخت یاوەرمان بوو و ڕزگارمان بوو. سەربازەکان لە خێڵی جیاواز بوون، بەڵام (دەمارگیریی سەربازی) لەو ساتەدا بەسەریاندا زاڵ ببوو و وەک یەک خێڵ دەر دەکەوتن بەرامبەر بە خێڵێکی دیکەی دوژمنیان، کە ئەویش خێڵەکەی ئێمەی خوێندکاری داماو بوو!"

ئەم وێناکردنە لە ئیبن خەلدوونەوە وەر گیراوە، کە پێی وایە، "دەمارگیری لە ڕەچەڵەکەوە دێت، پەیوەندیی خزمایەتی، لە مرۆڤدا سروشتییە، لە بەشێکی کەمیاندا نەبێت، کاتێک خزمە نزیکەکانی تووشی تەنگژەیەک یان ناخۆشییەک دێن، خزمەکانی دەخوازن ئەو ناخۆشی و تەنگژانەی لەگەڵدا بەش بکەن، ئەمەش هەر لە زووەوە شتێکی سروشتی بووە لەنێو مرۆڤەکاندا." ڕەچەڵەک لای ئیبن خەلدوون، "شتێکی وەهمییە و بوونی نییە،" بەڵام لەم دۆخەدا سوودبەخشە، بە هۆی ئەوەوە کە دەگۆڕێت بۆ جۆرێک لە دانەپاڵ و هاوپەیمانێتی، ئەمەش خۆی لەو هاوخەمییەدا دەبینێتەوە، کە دەمارگیری

دەیخاتە ئەستۆی، واتا، "هاوخەمی هەرتاکێک بەرامبەر خەڵکی هاوپەیمانییەکەی و خزمانی، بۆ ئەو نزیکییەی وای لێ دەکات هاوسێ، یان خزمەکانی بگرێتە خۆی."

وەک باسمان کرد، وەردی بایەخی پێویستی بە هزرە فەلسەفییەکان، لەتیۆریشیاندا هزرە خەلدوونییەکان نەداوە، بەڵکوو بە تێپەڕینی کات، وازی لێ هێناون پاشەکشە بکەن، لەوانەیە هۆکاری ئەمە بگەڕێتەوە بۆ نقومبوونی لە توێژینەوە لە رووداو و دیاردەکانی کۆمەڵگەی عێراقیدا و تۆمارکردنیان و شرۆڤەکردنیان لە چەند کتێبێکدا، کە زیاتر و زیاتر بەناوبانگ بوون و بوونەتە جێی مشتومڕ، بە هۆی ئەوەی لێوانلێون لە چەمکگەلی ململانێ و پەرەسەندن و ئازادی.

د. حسەین ئەلهەنداوی
بەغداد ۲۰۱۲

## سەرەتا

لێکۆڵینەوە لە مێژووی ئیسلامی لەبەر ڕۆشنایی تیۆرییە نوێکانی کۆمەڵناسیدا، بە کایەیەکی بەپیتی کایەکانی توێژینەوە هەژمار دەکرێت، چەندین کتێب دەربارەی سیما هەمەچەشنەکانی ئیسلام نووسراون، بەڵام دەتوانین بڵێین، هیچکام لەو کتێبانە هەوڵیان نەداوە بە شێوەیەکی جیددی لەو کارلێکە بکۆڵنەوە، کە لەنێوان ئایینی ئیسلام و ئەو کۆمەڵگەیەی تیایدا گەشەی کردووە، دروست بووە. لە ساڵی ١٩٣١دا، لە ئینگلتەرا کتێبێک بە ناوی *سۆسیۆلۆژیای ئیسلام* بڵاو کرایەوە، وەک لە پێشەکییەکەیدا هاتووە، لەسەر داواکاریی هێربەرت سپنسەر نووسراوە، وەک تەواوکارییەک بۆ کتێبەکەی بە ناوی *کۆمەڵناسیی وەسفی*. لە ڕاستییشدا ئەم کتێبە زۆر لەو کتێبانەی دەربارەی ئیسلام نووسراون، جیاواز نییە. کتێبەکە باس لەو تیۆرییانە دەکات، کە پەیوەستن بەو قۆناغە جیاوازانەی کۆمەڵگەی ئیسلامیان پێدا تێپەڕ بووە، هەروەها هەوڵێکە بۆ "پەیبردن بەوەی ئەو خەڵکەی باوەشیان بۆ ئیسلام کردۆتەوە، تاچەند

فەرمانبەرداری دەکەن.[1]" وەلی ئەمە مەبەستی جەوهەریی سوسیۆلۆژیای ئایین نییە، وەک کۆمەڵناسە هاوچەرخەکان باسی لێوە دەکەن. مەبەست لە کۆمەڵناسیی ئایین، وەک واک ڕوونی دەکاتەوە، "لێکۆڵینەوەیە لە پەیوەندیی ئاڵوگۆڕی نێوان کۆمەڵگە و ئەو کارلێکانەی لەنێوانیاندا ڕوو دەدەن.[2]" هەموو ئایینێک، لە سەرەتادا بۆ ڕەتکردنەوە یان وەک پەرچەکردارێک دژی دیاردەیەکی دیاریکراوی کۆمەڵگە سەرهەڵدەدات. لە ڕووی تیۆری و پراکتیکییشەوە، بەپێی گۆڕانکارییەکان، ئەویش دەگۆڕێت. لە گەشەکردنی دونیایی و سەرکەوتن و شکستەکانی و سروشتی ئەو خەڵکەی باوەڕیان پێیەتی... هتد.

چەندین نووسەر لە مێژووی ئایینی مەسیحی و تەنانەت یەهودییان کۆڵیوەتەوە[3]، لە کاتێکدا کەموکورتییەکی گەورە لە لێکۆڵینەوەکانی ئیسلامدا بەدی دەکرێت.

بەم دواییانە لە میسر، کە بە چەقی جیهانی ئیسلامی هەژمار دەکرێت، زنجیرەکتێبێک بڵاو کرانەوە، لەنووسینی دکتۆر ئەحمەد ئەمین، مامۆستای زانکۆی میسرن و بابەتی مێژووی کۆمەڵایەتیی ئیسلام تاوتوێ دەکەن. ناوەندە ڕۆشنبیرییە عەرەبییەکان بە هەڵپە و ڕێزەوە پێشوازییان کردن، ئەمە یەکەمین هەوڵی ڕاستەقینە بوو بۆ ڕاڤەکردنی مێژووی کۆمەڵایەتی و تایەفیی ئیسلام، لە ڕوانگەیەکی هاوچەرخەوە. بێگومان ئەم کارە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ لێکۆڵینەوە لە ئیسلام، لێکۆڵینەوەیەکی کۆمەڵایەتی، بەڵام بە هیچ شێوەیەک

١ ڕوبن لیفي، *سوسیولوجیا الإسلام*: ص ٦.

٢ ج. واک، *سوسیولوجیا الدین*: ص ١١.

٣ بۆ نموونە، بڕوانە کتێبی (س. فینکلشتاین، *الفرنسیون: الخلفیة السوسیولوجیة لعقائدهم*).

کارێکی سۆسیۆلۆژی نییە. پێدەچێت ئەحمەد ئەمین سەر بەو قوتابخانە کۆنە بێت، کە بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا هەڵە و دروست لێکدی جودا دەکاتەوە. تا هەنووکەش، بەپێی ڕێکخستنێکی بەهایی جێگیر و حەقیقەتگەلێکی ڕەها، بیر لە پرسە کۆمەڵایەتییەکان دەکاتەوە، بە جۆرێک، بەشێکی گەورەی کارەکەی تەرخان کردووە بۆ لێدان لە چەندین هزر و بەرزڕاگرتنی چەند هزرێکی دیکە، بێ ئەوەی لە خۆی بپرسێت، کاتێک ئەم هزرە، یان ئەوی دیکەی تەبەنی کردووە، ئاخۆ خەڵکی لە هەڵبژاردنەکانیاندا سەربەست بوون، یاخود لەلایەن بارودۆخە کۆمەڵایەتییەکانیانەوە ناچار کراون. ئەو لە ڕوانگەیەکی خاڵی لە تێڕوانینی واقیعییەوە بڕیار لەسەر هەر کردەیەکی کۆمەڵایەتی دەدات. دەتوانین بڵێین، ئەحمەد ئەمین پاشخانێکی فەلسەفیی هەیە، نەک پاشخانێکی کۆمەڵایەتی، لەبەر ئەوە، دەبینین لۆژیکی ئەرستۆیی بەسەر پرسە کۆمەڵایەتییەکاندا پراکتیزە دەکات.

ئەم لێکۆڵینەوەیە، جیاواز لەو کارانەی باس کران، هەوڵ دەدات لە چەند تیۆرییەکی کۆمەڵایەتیی ئیسلام بکۆڵێتەوە، نەک وەک هزرگەلێکی لۆژیکی، کە لە فەراغدا بوونیان هەیە، بەڵکوو وەک ئایدیۆلۆژیاگەلێک، کە لە کارلێکی بەردەوامدان لەگەڵ ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییانەی تیایاندا دەر دەکەون.

پێویستە ئەوەش باس بکەین، ئەم لێکۆڵینەوەیە توێژینەوەیەکی گشتگیر نییە بۆ تەواوی کایەکانی سۆسیۆلۆژیای ئیسلام، چونکە ئەم کارە زۆر لەوە گەورەترە تاکە توێژەرێک توانای بەسەریدا بشکێت. ئەم کارە بایەخ بە لێکۆڵینەوەی لایەنێک لە لایەنەکانی ئەو کایەیە دەدات، ئەویش

گرفتی ئیسلامە، یان بە گوزارشتێکی دیکە، ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزمە لە مێژووی ئیسلامدا.

ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزم، وەک دواتر دەیبینین، لە تەواوی قۆناغەکانی کۆمەڵگەی مرۆییدا بوونی هەبووە، زیدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین، ئەم ململانێیە بە شێوەیەکی توند لە مێژووی ئیسلامدا خۆی دەر خستووە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا، هەوڵ دەدەین هۆکارەکان و پەرەسەندنی ئەم لایەنە جیاوازەی ئیسلام بخەینە ڕوو.

لێرەدا و بەر لەوەی بچینە نێو لێکۆڵینەوەکەوە، پێویستە خاڵێک ڕوون بکەینەوە، لەم باسەدا هەردوو چەمکی (ئایدیالی) و (واقیعی) بە مانا باوەکەیان بەکار هاتوون، نەک بە مانا فەلسەفییەکەیان.

دکتۆر تایتۆس دەڵێت:

عەقڵیەتی گشتی، تێگەیشتنێکی زۆر جیاوازی هەیە بۆ چەمکی (ئایدیالی) وەک لە بەکارهێنانە فەلسەفییەکەی ئەم چەمکە، دەشێ وشەی ئایدیالی لە تێگەیشتنی باودا بەم مانایانە بێت:

١. ئەو کەسەی بە پێوەرگەلێکی ئاکاری و ئیستاتیکی و ئایینیی باڵا ڕازییە و دەژی، بەم جۆرە مرۆڤە دەگوترێت، کەسێکی نموونەیی یان ئایدیالی.

٢. ئەو کەسەی دەتوانێت لەسەر پلانێکی دیاریکراوی دوور لە جیهانی واقیعی بڕوات، بەم واتایە بێت، هەموو چاکسازێکی کۆمەڵایەتی و پەیامبەرێک، کەسێکی ئایدیالییە، چونکە بانگەشە بۆ شتگەلێک دەکەن، کە تا هەنووکە بوونیان نییە...

مانای فەلسەفیی چەمکی ئایدیالی بە هەردوو چەمکی (هزر-Idea) و (عەقل-Mind) دیاری دەکرێت، زیاتر لە چەمکی (ئایدیالیست-Idealist)، لە ڕووی واتاوە، چەمکی (Idea-ism) زیاتر گوزارشت دەکات وەک لە چەمکی (Idealism)، ئەم چەمکەی دوایی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە، کە واقیع زیاتر لە بیرۆکە و هزر و عەقڵەوە نزیکە وەک لەوەی لە هێزە مادییەکانەوە نزیک بێت[1]...

هەروەها ئایتوس لە درێژەی قسەکانیدا دەربارەی واقیعی، جیاوازی دەکات لەنێوان مانای باو و مانای فەلسەفیی ئەم چەمکەدا و دەڵێت، "دەشێ واقیعی بە مانا باوەکەی، بەئاگابوونی حەقیقەت و وردەکارییەکانییت لەهەمبەر خەیاڵدا[2]."

لەمیانەی ئەم باسەمانەوە دەربارەی جیاوازیی نێوان بەکارهێنانی باو و بەکارهێنانی فەلسەفی ئەم چەمکانە، دەچینە نێو لێکۆڵینەوە لە گرفت و ڕۆڵی لە پێکهێنانی مێژووی کۆمەلایەتی و مەزهەبی ئیسلامدا.

---

١ هـ هـ تایتس، *قضايا حية في الفلسفة*: ص ٢٣٦.
٢ هەمان سەرچاوە: ص ٢٦٨.

# پێشەکی

مەبەست لەم توێژینەوەیە، لێکۆڵینەوەیە لە مێژووی کۆمەڵایەتیی ئیسلام، لەژێر ڕۆشنایی ئەو چەمکەی لە کۆمەڵناسیی ئایینیدا پێی دەوترێت (گرفتی کڵێسا).

چەند کۆمەڵناسێک لە شوێنەوارە کۆمەڵایەتییەکانی گرفتی تایبەت بە ئایینی مەسیحییان کۆڵیوەتەوە[1]، بەڵام بەپێی زانیاریی ئێمە، تا ئێستا هیچکەس لەم شوێنەوارانە و پەیوەندییان بە ئیسلامەوەی نەکۆڵیوەتەوە.

پێمان وایە ئەم گرفتە ڕۆڵێکی گەورەی لە مێژووی ئیسلامدا گێڕاوە، وەک لە مێژووی مەسیحیەت. لە ڕاستیدا ئیسلام وەک شتروتمان باسی لێوە دەکات، دیاردەیەکی سیاسی-ئایینییە[2]. لە ڕاستییەکیشدا، لە ئایینی مەسیحی جیاوازە، "ئیسلام بەرجەستەکەری سیستەمێکی کاملی

---

١ ڤون وایس هاوەرد بیکر، *الدین في الصراع على السلطة*، الفصل الثاني. ماکس ڤیبر، *المجتمع و الاقتصاد*، الجزء الثاني، الفصل الرابع. ریتشارد تاینر، *المنابع الاجتماعیة للطائفیة*.

٢ ر. شتروتمان "الشیعة" موسوعة الإسلام: المجلد الرابع، ص ٣٥٠.

ژیانە[1]." نالێت "ئەوەی هیی قەیسەرە بیدە بە قەیسەر و ئەوەشی هیی خودایە، بیدە بە خودا،" بەڵکوو ئەو بڕوای بەوەیە، کە قەیسەر[2] بریکاری خودایە لەسەر زەوی و هەردووکیشیان (قەیسەر و خودا) بەیەکەوە کار دەکەن بۆ یەک مەبەست. لەبەر ئەوە جێی سەرسوورمان نییە، لە قۆناغە زۆر سەرەتاییەکانی مێژووی ئیسلامدا، ململانێیەکی قووڵ بەدی دەکەین، لەنێوان ڕێنماییەکانی خودا و ڕێنماییەکانی قەیسەردا، واتا لەنێوان پرنسیپە ئاینییەکان و بەرژەوەندییەکاندا، یاخود لەنێوان (ئایدیالی) و (واقیعی)دا، هەر وەک پێشمان وایە باشترە لەم لێکۆڵینەوەیەدا ئەم چەمکانە بەکار بهێنین.

یەکەمین ناکۆکیی تایەفی کە لە کۆمەڵگەی سەرەتای مەسیحیەتدا پەیدا بووە، لەدەوری چییەتیی مەسیح و خوادا دەسووڕێتەوە[3]. ئەم ناکۆکییەش لە بیرکردنەوەیەکی غەیبیی میتافیزیکیی ڕووتەوە سەرچاوەی گرتووە. لەهەمبەر ئەمەشدا، کۆمەڵگەی مسوڵمانان شڵەژا و خەریک بوو دوای کۆچی دواییی پێغەمبەر، لە بنەماکان لا بدات، بە هۆی ململانێیەکی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، کە لەنێو ئەو خەڵکە ئایدیالیستانەی، بە شێوەیەکی بەهێز، بە بەها

---

١ ماجد خضوري، *قانون الحرب و السلم في الإسلام*: ص ٣.

٢ لێرەدا وشەی قەیسەر بە مانا مەجازییەکەی بەکار هێنراوە، ئەمەش بۆ بەراوردکردنی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت. لەوەدا کە پەیوەستە بە فەرمانڕەوای دونیایی، لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوەش بکەین، ئیسلام دان بە هیچ حاکمێکی نامسوڵماندا نانێت.

٣ ر. فی. د. ماغوفین و ف. دانکاف، *التأریخ القدیم و الوسیط*: ص ٣٩٤.

ئاینییەکانەوە پەیوەست بوون، بە چاوپۆشین لەوەی لە کۆمەڵگەدا ڕوو دەدات لە لایەک و لەنێوان ئەوانەدا کە بە شێوەیەکی سەرەکی کاریگەر بوون بە مەیلی واقیعی و بەرژەوەندی دونیایی کۆمەڵگەی مسوڵمانانەوە، لە لایەکی دیکەوە.

***

پێمان وایە ئەم ململانێیە لەنێوان ئایدیالی و واقیعیدا[1] - یان وەک کۆمەڵناسەکان بە (گرفتی کڵێسا) ناوی دەبەن - تەنها لە کایەی ئاییندا کورت نەبوەتەوە، بەڵکوو دەتوانین لە چەندین کایەی دیکەی کۆمەڵگەی مرۆییشدا بەدیی بکەین[2]. بڕوامان وایە ئەم گرفتە لە هەرجێگەیەک بە جۆرێک لە جۆرەکانی ئایدیالی لە عەقڵی خەڵکیدا بوونی هەبێت، هەر ڕوو دەدات.

پرۆفیسۆر فۆن وایس وای دەبینێت، ئەم دابڕانەی نێوان ئایدیالی و واقیعی بەتەنها لە بوونیادی کۆمەڵایەتیدا دەبینرێت، کۆبوونەوە مرۆییەکانی وەک خێزان و عەشیرەت، بەرئەنجامی جۆرێکی دیکەی دابڕانە، مەرج نییە ئەم کۆبوونەوانە هەڵگری مەیلی بەکۆمەڵ بن، بەڵکوو ئەوەی جیای دەکاتەوە ئەو هاریکارییە توندوتۆڵەیە، کە لەنێوان

---

١ لەوەیە سوودبەخش بێت لێرەدا دووبارە جەخت لەوە بکەینەوە، کە هەردوو چەمکی (ئایدیالی) و (واقیعی) بە مانا باوەکانیان بەکار هاتوون، نەک مانا فەلسەفییەکانیان.

٢ میلتون ینغر منقول فی المصدر نفسه اعلاه، ص ٢٣٠-٢٣١.

هێزە بایۆلۆژی و کۆمەڵایەتییەکاندا هەیە[1].

بڕوامان وایە تەنانەت لەم کۆبوونەوە زیندەگییە کۆمەڵایەتییانەشدا، کە وایس باسیان لێوە دەکات، دەکرێ تا رادەیەک گرفت هەبێت. تەنانەت لەنێوان دوو برای یەک خێزانیشدا، هەندێک جار دەتوانین جۆرێک لە کێشە بەدی بکەین، کە لەو ناکۆکییەی نێوان نموونەی ئایدیالی پەیوەندیی برایانەوە سەرچاوە دەگرێت، کە کۆمەڵگە دایان دەنێت. لەگەڵ ئەو بەرژەوەندییە واقیعییانەدا برایەک دەکەن بە دژی براکەی دیکەی.

بە شێوەیەکی گشتی، یەکێک لە جیاوازییەکانی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵ ئەوەیە، کە مرۆڤ بەردەوام جۆرێک لە نموونەی بالای هەیە و چاوی لەسەریەتی و بەردەوام هەوڵ دەدات پێی بگات، بەلام پێویستە لێرەدا ئاماژە بە خالێکیش بکەین، ئەویش ئەوەیە تەواوی مرۆڤەکان لە ڕەوتە ئایدیۆلۆژییەکەیاندا یەکسان نین، هەندێکیان زیاتر لەوانی دیکە ئایدیالین، لەبەر چەند هۆکارێک، کە بوار نییە لێرەدا ئاماژەیان پێ بدەین. لێرەدا - پێمان وایە - سەرچاوەی سەرەکیی گرفتەکە ئەوەیە: زۆر جار ململانێ لەنێوان ئەو کەسانەدا دێتە ئارا، کە بەشێوەیەکی سەرەکی پێداگریی لەسەر کاملی ڕووت دەکەن، بەپێویستی دەزانن کۆمەڵگەی مرۆیی لەسەری دابمەزرێت و ئەو کەسە پراکتیکیانەش بە شوێن ڕەوتە واقیعییەکانەوەن لە کۆمەڵگەدا.

---

١ لیوپولد فون وایس، *علم الإجتماع النظامی*، صححه و زاد علیه هاورد بیکر: ص ٦٢٠.

گۆیدۆ دو ڕۆگیرۆ، دەڵێت:

چەمکی ئایدیالی بە مانا فراوانەکەی، واتا بوونی مەیل بۆ بەربەرەکانی کردنی وێنە عەقڵییەکان (هزر و نموونەکان) لە بەرژەوەندیی واقیعی ئەزموونی و پێگە و ڕۆڵێکیشی لە تەرازووی بەها مرۆییەکاندا پێ ببەخشرێت. هزر و نموونەکان بە شێوەیەکی سروشتی بەپێی توانا سەربەخۆن لە سنووردارێ و لەنگییەکانی واقیعی ئەزموونی و بە لایەنی کەمیشەوە، خواستیان هەیە بگەنە کەمال و ڕەهایی، ئایدیالی لە تێگەیشتنە باوەکەیدا، مرۆڤ بەرەو ژیانێک دەبات، لە جیهانی ئایدیالی و دوور لەوەی خەڵکی بە واقیعی باو هەژماری دەکەن و گوێش بەو جیهانە نزمە نادات، تەنانەت لە مانا فەلسەفییەکەشیدا، هەمان ئەم مەیلانە دەدرێتە پاڵ ئایدیالی، تا وێناکردنێکی ڕۆحی بە سروشتی مرۆڤ و ئەزموونی مرۆیی ببەخشێت[1].

ناتوانین نکوڵی لەوە بکەین، کە بەشێکی گەورەی ئەو پێشکەوتنەی مرۆڤایەتی لەمیانەی مێژووە دوورودرێژەکەیدا بەدەستی هێناوە، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەوڵانەی لەڕووکاردا بەهەدەر چوون، لەگەڵ جیهانی ئایدیالی خەیاڵیی خەڵکی ئایدیالی، ڕاستە ئەم خەڵکە لەپێناو ئامانجگەلێکی ئەستەم، یان ناپراکتیکیدا خەبات دەکەن، بەڵام سەرباری هەموو

١ غ. دو روغيرو، (المثالية) موسوعة العلوم الإجتماعية، المجلد السابع: ص ٥٦٨.

شتێک، ئەو ئامانجە بالایانەی بانگەشەی بۆ دەکەن، ئامانجگەلێکی بەکەڵکن، ئەو ئامانجانە ئەوەی بیر دەخەنەوە، کە بەردەوام ئامانجگەلێکی دیاریکراو لە بەردەم مرۆڤدا هەن و پێویستە بەدەستیان بهێنێت. بەم ڕێگەیە، زۆرێک لەو بەهایانەی ئێمەی بڕوادار شانازییان پێوە دەکەین، پەرەیان سەندووە، وەک دیموکراسی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتی و چەندین بەهای باڵای دیکە.

ڕاستە تا جیاوازیی نێوان ئایدیالی و واقیعی زیاد بکات، قەبارەی کێشەکانیش گەورەتر دەبن. بەڵام لە هەمان کاتدا پێشکەوتنیش زیاد دەکات، پێدەچێت کێشە و پێشکەوتن هاوشانی یەکدی بڕۆن. کۆمەڵگە جێگیرەکان ئەگەر کێشەیان نەبێت، ئەوا کێشەیان زۆر کەمە، ئایدیالی و واقیعی لەم کۆمەڵگەیانەدا، پەیوەندییەکی بەهێز بەیەکیانەوە دەبەستێت. هەموو پێغەمبەر، یان چاکسازێکی کۆمەڵایەتی، هەوڵ دەدات ئەم کۆمەڵگەیە هۆشیار بێت بەرامبەر ئایدیالی، ئەمەش بەر لە هەموو شتێک گرفتێک بۆ ئەو کۆمەڵگەیە دەخوڵقێنێت، کە مەترسیدار و سوودبەخشە لە یەک کاتدا.

وا دەر دەکەوێت ئەمە هەڵوێستێکی جەوهەری بێت و لەپشت کێشە گەورەکەی مێژووی ئیسلامەوە وەستابێت. ئەو سارانشینانەی پێغەمبەر (محەمەد) لەنێویاندا دەر کەوت – وەک ئەحمەد ئەمین، مامۆستای ئەدەبی عەرەبی لە زانکۆی میسر ئاماژەی پێ دەدات – زۆر شانازیی بە کولتووریانەوە دەکەن و قەناعەتێکی گەورەشیان بە شێوازی ژیانیان هەیە، بە پلەیەک، هەرگیز بە خەیاڵیاندا نایەت شتێکی باشتر

لەوەی ئەوان بوونی هەبێت، ئەوان بە هۆی سنووردارێی بیرکردنەوەیانەوە، بە (ئایدیالیزم) ئاشنا نەبوون، لەبەر ئەوە هیچ وشەیەک لە زمانەکەیاندا نییە گوزارشت لەم چەمکە بکات[1]...

لێرەدا ئاماژە بە شتێک دەکەین، کە پەیوەستە بە بابەتەکەمانەوە، توینبی بە شێوەیەکی گشتی سارانشینان دەخاتە دەستەیەکی شارستانی پەکشیوەوە، "لە ژیاندا ماون، بەلام نەیانتوانیوە گەشە بکەن[2]."

لەم جۆرە کۆمەڵگەیەدا، محەمەد بە نموونە باڵاکانیەوە دەر دەکەوێت، لە سەرەتاشدا ئەو کەسانە شوێنی کەوتن، کە زۆر کاریگەر نەبوون بە کولتووری چێژی هەستی سارانشینەکان، وەک دواتر دەبینین. لە کۆتاییدا، کاتێک ئیسلام بوو بە سیستمێکی سیاسیی زاڵ، سارانشینە عەرەبەکان هاتنە نێو ئیسلامەوە، لەبەر ئەوە، دروستبوونی گرفت شتێکی حەتمی بوو، وەک ئەحمەد ئەمین دەڵێت:

> ئیسلام عەرەبەکانی بە یەک ڕەنگ بۆیە نەکرد، بەڵکوو باشترینیان ئەو کەسانە بوون لە کۆچکردووان و پشتیوانان، کە سەرەتا ئیسلام بیوون، ئەو کەسانە ئایین گەیشتبووە ناخیان، دڵسۆز بوون بۆی و فەرمایشتەکانیشیان بەجێ دەهێنا، وەلێ ئەوانەی ڕۆژی فەتح، یان دواتر مسوڵمان بوون و لەسەر بێباوەڕی و بەرهەڵستیی

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*، ص ٣٧.

٢ آرنولد توينبي، *دراسة للتاريخ*، لخصها دي. سي. سومرفيل، ص ١٦٤.

> خۆیان بەردەوام بوون تا پێغەمبەر و هاوەڵانیان بێنی سەر دەکەون، هیچ شتێک بەفریایان نەگەیشت، ئیسلام نەبێت، هەر بۆیە ئایینی زۆرینەیان ناسک بوو[1].

لەبەر ئەوە، ئەو ململانێیەی لەنێوان بەهاکانی ئیسلام و ڕەوتی سارانشینیدا هاتە ئارا –بەپێی ئەحمەد ئەمین - توند و درێژخایەن بوو[2].

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*، ص ٨٢

٢ هەمان سەرچاوە.

ئیسلامی ئەمڕۆ، دوو لقی سەرەکی لەخۆ دەگرێت - سوننە و شیعە – لە راستیدا لە رووی پرسە ئایینی و جەوهەرییەکانەوە، هیچ جیاوازییەک لەنێوان سوننە و شیعەدا نییە[1] وەک جەمالی گوزارشتی لێوە دەکات. هەردوو مەزهەبەکە بە هەمان قۆناغەکانی پەرەسەندن و هەمان کارلێکی کۆمەڵایەتیدا گوزەریان کردووە. لەبەر ئەوە، ئەمڕۆ لە زۆر تایبەتمەندیی سەرەکییاندا لێکدی دەچن. ئەو جیاوازییەی کەسێکی بێلایەن دەتوانێت بەڕوونی تێبینیی بکات، ئەو گۆشە نیگایەیە کە هەریەک لە مەزهەبەکان لەمیانەیەوە لە مێژووی سەرەتای ئیسلام دەڕوانن، هەروەها ئەو رێگەیەی پێی راڤە دەکەن. سوننە وا سەیری ئیسلام دەکەن، وەک ئەوەی پرۆژەیەکی سیاسیی پیرۆز بێت، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا بە ناوی خوداوە زۆرێک لە وڵاتان فەتح کران و لەگەڵ خۆشیدا سیستەم و مەعریفە و ئایینی بۆ جیهان هێنا. لە لایەکی دیکەشەوە، شیعە وای دەبینن کە فتوحاتەکانی ئیسلام گرنگ نین، ئەوان وەک سوننەکان دان بەو ئیمپراتۆریەتە پەلهاویشتووە ئیسلامییەدا نانێن، کە خەلیفە و سەرکردە سەربازییەکان بوونیادیان ناوە. ئەوان جەخت لەسەر ئەو

[1] محمد فاضل الجمالي، *العراق الجديد*، ص ٨٨

شێوە مامەڵەیە دەکەنەوە، کە فەتحکەرەکان لەگەڵ خەڵکیدا دەیانکرد، هەروەها لەسەر پلەی دڵسۆزییان بۆ ئایینی خودا.

لەبەر ئەوە، پێویستە ئاوڕێک لە مێژووی سەرەتای ئیسلام بدەینەوە، تا لە بنەچەی ناکۆکیی سوننە و شیعە و پەیوەندی بە گرفتی ئیسلامەوە تێبگەین. لە ڕاستیدا، ناکۆکیی نێوان سوننە و شیعە، کە ڕاستەوخۆ دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر سەری هەڵدا، گرنگییەکی گەورەی بۆ بابەتەکەمان هەیە.

بە بڕوای ئێمە، دووانەی سوننە-شیعە هاوشێوەی هەمان ئەو دووانەیەیە، کە یەنگر بە دووانەی کڵێسا -مەزهەب ناوی دەبات، واتا ململانێی نێوان ڕیالیزم و ئایدیالیزم[1].

تا ئێستاش چەندین بیریار هەن، بەتایبەت لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا، کە مشتومڕ لەسەر پرسیارە تەقلیدییەکە دەکەن؛ کام لەم دوو گرووپە لەسەر حەقن؟

لە ڕووی سۆسیۆلۆژییەوە، نە حەقی ڕەها بوونی هەیە، نە ناحەقیی ڕەها، هەردوو لایەنەکە ڕاستن و لە هەمان کاتیشدا هەڵەن، هەریەکەیان لایەنێک لە لایەنەکانی حەقیقەتیان لایە.

ئیسلام – وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە – سیستمێکی سیاسی-کۆمەڵایەتییە، بۆ ئەوەی هێزی سیاسییش بەدەست بهێنێت، پێویستە ئەم سیستمە لەگەڵ بەرژەوەندییە دونیاییە جۆربەجۆرەکاندا خۆی بگونجێنێت. بەڵام لە لایەکی دیکەوە، هەندێک بنەمای ئایینی و ئایدیالیی ڕووت هەن، کە پێغەمبەران هەوڵیان بۆ بەدیهێنانیان داوە و بە هەرنرخێک بووە، دەبێت

---

1 میلتون یِنغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: ص ٢٣٠.

لەبەرچاو بگیرێن، ئەمەش بۆ هەردوو لایەنی گرفتەکە یەکلایی بۆتەوە.

لە ڕاستیدا ئەم بابەتە بە شێوەیەکی گشتی کێشەی مرۆڤە. مرۆڤ کاتێک دەکەوێتە نێوان دوو هێزەوە، کە هەریەکەیان بە ئاراستەی پێچەوانەی ئەوی دیکەدا پەلکێشی دەکەن، ڕیالیزم و ئایدیالیزم، ئەوا دەستەوەستان دەوەستێت.

پەنگر وای دادەنێت، کە هەریەک لەم دوو میتۆدە خاڵی بەهێز و لاوازی خۆیان هەیە. ئەگەر مەیلی ڕیالیستی بە شێوەیەکی تەواو بڵاو ببێتەوە، ئەوا گونجان بەرەو چەقبەستن دەڕوات، خۆ ئەگەر مەیلی ئایدیالیستی بڵاو ببێتەوە، ئەوا وزەی گروپ لە هێرشی بێئەنجامی دژ بە هێزگەلی مەزن بەفیڕۆ دەچێت[1].

لە ڕاستیدا سوننەکان لە پەرەدانی فیعلی بە ئیسلام، زۆر دوور ڕۆیشتوون، بە جۆرێک، شەریعەتیان بۆ زۆر کاروبار سەربار کردووە، کە هاودژن لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی[2]. فەقیهەکانیان - وەک گۆڵدتسیهەر و ماکدۆناڵد ڕوونی دەکەنەوە - "مرۆڤگەلێکی شوێنکەوتەی حکومەتن[3]." لەلایەکی دیکەوە، ژیانی شیعە ژیانێکی شۆڕشگێڕانە بووە و لای ئەوان خەلیفەکان جگە لە ستەمکاریی بەزۆرسەپاو، چیی دیکە نەبوون. شیعەکان لە ڕاڤەکردنە لۆژیکی غەیبییەکانی

١ هەمان سەرچاوە: ص ٢٣٠.

٢ د. ب. ماکدۆناڵد، بند (الإجماع)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٤٤٨. رینولد نیکولسن، *تاريخ الأدب العربي*: ص ١٧٩. أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢٨٦.

٣ د. ب. ماکدۆناڵد، بند (إجتهاد) *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٤٤٨.

ئایینی ئیسلامدا هێندە قووڵ بوونەتەوە، گەیشتوونەتە ڕادەی پەرگیری، لەبەر ئەوە، ئەوان چەندین بیروباوەڕی هزریی ناپراکتیکیان سەبارەت بە پرسی خیلافەت سەرپار کردووە[1].

سوننەکان وای دەبینن، شیعە خەلکێکی بیدعەکارن، لەسەر ئەو بنەمایەی ئیسلامیان دووکەرت کردووە و ئەو پەیمانەشیان شکاندووە، کە دابوویان بۆ دلسۆزییان بۆ حکومەت. لەبەرامبەریشدا، شیعەکان وای دەبینن سوننە ستەمکارن، چونکە فەرمانبەردارییی ئەو خەلیفانەیان کردووە، کە لە ڕێی هێزەوە خیلافەتیان داگیر کردووە و لە پرنسیپ و نموونە بالاکانی پێغەمبەر لایان داوە و شێواندوویانن[2].

بە ڕای ئێمە، حەقیقەت دەکەوێتە ناوەندی هەردوو گروپەکەوە و هەریەکەشیان لە ڕوانگەیەکی پێچەوانەی لایەنەکەی دیکەوە لێی دەڕوانێت. دەتوانرێت ئەو ناکۆکییەی لەنێوان ئەم دوو لایەنەدا هەیە، بەو جموجوڵە سیاسییە بەراورد بکرێت، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەیە. ماکس ڤیبەر کلێسا و مەزهەبەکان بە شێوەیەکی گشتی، وەک جۆرگەلی (پارت) دەبینێت؛ واتا دەستەگەلێکن، تاکە خەمیان ململانێیە لەسەر دەسەلات[3].

لە ڕاستیدا دەتوانین بێ دوودڵی سوننە و شیعە بە پارتی سیاسی بەراورد بکەین. چونکە بابەتی خیلافەت ئەو پرسە سەرەکییەیە، کە لە سەرەتادا بووەتە هۆی دروستبوونی ئەم

---

١ دوایت دونالسون، *المذهب الشیعی*، الفصول ٢٩-٣٠. أحمد أمین، *فجر الإسلام*، الجزء الثانی، الفصل الرابع.

٢ دوایت دونالسون، *المذهب الشیعی*: ص ٢٢٨.

٣ میلتون یتغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: ص ٢٢٠.

دوو گرووپە، وەک دواتریش دەیبینین. لە ئەنجامدا، دەشێ دروست بێت بڵێین، مەزهەبی سوننە وەک پارتی فەرمانڕەوا وایە، لە کاتێکدا مەزهەبی شیعە پارتی ئۆپۆزسیۆنە. لەوانەیە ئەم بەراوردە لە ڕاڤەکردنی هەندێک لەو ناکۆکیانەدا هاوکاریمان بکات، کە لە مێژووی سەرەتای ئیسلامدا ئەم دوو گرووپەی لێکدی جودا کردەوە، کە ئەوکاتە خیلافەت لە تروپکدا بوو.

ئەحمەد ئەمین و چەند مێژوونووسێکی دیکە ئاماژە بەوە دەکەن، مەزهەبی شیعە، لە سوننە زیاتر گرنگی بە فەلسەفە و بیرکردنەوەی رووت دەدات[1]. شیعەکان زۆر زیرەک بوون لە ئاشکراکردنی لادانی پەرەسەندنی فیعلیی ئیسلام لە پرنسیپە ڕەسەنەکانی و لە دۆزینەوەی زۆر هاودژی ئابڕوویەن، کە حکومەت دوای مردنی پێغەمبەر ئەنجامی دان. بەردەوام جۆرێکی دیاریکراو لە نموونەی باڵا بە زیهنی شیعەکاندا دەهاتن و دەچوون، کە لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەرەوە وەریان گرتبوون و هەوڵیان دەدا مسوڵمانان لەو جیاوازییە گەورەیە ئاگادار بکەنەوە، کە لەنێوان ئەو نموونە باڵایانە و ئەوەدا هەیە، کە لە واقیعدا هەن.

ئەو هۆکارەی لەپشت مەیلە ئایدیالییەکانی شیعەوە ئامادەییی هەیە، پێمان وایە ئەوەیە، کە ئەوان بەردەوام لەلایەن حکومەتەکانەوە چەوسێنراونەتەوە، زۆر بەکەمی نەبێت لە وەرگرتنی فەرمانڕەواییدا بە شێوەیەکی فیعلی،

---

[1] أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ١٩٠. أمير علي، *روح الإسلام*: ص ٥٣٧.

بەخت یاوەریان نەبووە، دانکن کالدویل دەڵێت: "**باشترین ڕێگە بۆ دەرکردنی مرۆڤ لە خەوەبێداری و قاچەکانی بخرێتە سەر زەوی، ئەوەیە بەرپرسیارێتییەکی گەورەی بخەیتە ئەستۆ**[1]."

لە لایەکی دیکەوە، سوننە زۆرینەی کۆمەڵگەی مسوڵمان پێک دێنن، ئەوانەی بە بایەخێکی زۆرەوە بەدواداچوونیان هەیە بۆ هەڵگەڕانەوەکانی دەسەڵاتە سیاسییەکانی ئیسلام، بە ڕێگەیەک لە ڕێگەکانیش هەوڵیان داوە بەرگری لە هەڵسوکەوتەکانی حکومەت بکەن، بەدوای بیانووگەلێکیشدا گەڕاون، تا بانگەشەکانیان بۆ شەرعیبوون لەسەری دابمەزرێنن، بە چاوپۆشین لەوەی ئەو شەرعییەتە بەرامبەر ئەوانی دیکە درندە و ستەمکارە. شتروتمان دەڵێت:

> سوننەکان بەرەنگاری ئەو داواکارییە زیرەکانەیە بوونەوە، کە دەبێت فەرمانڕەواکان، ئەوانەی نوێنەرایەتیی دەوڵەتی ئایینی دەکەن، خاوەن کەسێتییەکی ئایینی بن، هەروەها کێشەی دۆزینەوەی هاوکێشەیەک کە واجیبوونی ئایینی ڕوون بکاتەوە بۆ فەرمانبەرداری خەلیفە کەمبایەخەکان، تەنانەت هی سوڵتانە بیانییەکانیش، چونکە ئەوان پارێزگاری لە بوونی ئایین و سیستەم دەکەن[2]."

جێی بایەخە بەدوای ئەو ڕێگە جۆراوجۆرانە بکەوین، کە

١ مجلة کورونیت، عدد مارس/آذار ١٩٤٨، ص ٧٧.

٢ ر. شتروتمان بند "الشیعة" *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع، ص ٣٥.

سوننە لەمیانەیانەوە هەوڵیان داوە بیانوو بۆ فەرمانبەردارییان بۆ حکومەت بهێننەوە، سەرەڕای ئەوەی حکومەتێکی نائاینییش بێت. بەلای ئێمەوە، چەند پلەیەکی جیاوازی مەیلگەلی واقیعی لەنێویاندا – سوننەکان – هەیە لەم بارەیەوە، وا دەر دەکەوێت هەندێکیان لەوانی دیکەیان واقیعیتر بن. دەتوانین دوو باڵ لەوانەی پەرگیرییان کردووە بە دوو ئاراستەی پێچەوانەی پرسەکە و گروپێکی دیکەش، کە دەکەونە ناوەندی ئەوانەوە دیاری بکەین. ئەم هەڵوێستەش لەو پێکهاتەیە دەچێت، کە لەنێو زۆرینەی پارتە سیاسییەکانی ئەمڕۆدا هەیە. دەبینین ئەوانەی خاوەن ڕەوتێکی واقیعین، لەنێو سوننەکاندا کەمینەن، ئەوانەشی خواپەرست و سۆفین، هەوڵ دەدەن پارێزگاری لە حکومەتە بێباوەڕەکان بکەن لەسەر بنچینەی پێویستی. دەتوانین غەزالی ئەو فەقیهە سۆفییە ناسراوەی سوننەکان بە بەلگەی ئیسلام ناوی دەبەن[1]، وەک نموونەی ئەم جۆرە هەڵوێستە بەرامبەر حکومەت وەر بگرین، غەزالی دەڵێت:

> ئەمە سنگفراوانی نییە لەهەمبەر سەرپشکیی هەڵبژاردن، وەلی ناچارییەکان ڕێگە بە قەدەغەکان دەدەن، دەزانین خواردنی ئاژەڵی مردارەوەبوو قەدەغەیە، بەلام مردن لەو بەهێزترە. خۆزگا دەمزانی ئەو کەسەی ئەمە پەسەند ناکات و بە بیانووی نەبوونی مەرجی تەواو، بەپێویستی دەزانێت لە ئێستادا پێشەوایەتی هەڵبوەشێتەوە، لە کاتێکدا خۆی دەستەوەستانە لەوەی ئەو پێشەوایە

---

[1] ت. ج. دیبور، *تاریخ الفلسفة فی الإسلام*، الفصل الخامس.

بگۆڕێت، چونکە خودی خۆشی ناتوانێت مەرجەکان بەجێ بهێنێت، ئایا کام بارودۆخەیان باشترە: بڵێت قازییەکان کەنار بخرێن و هەرێمەکان هەڵبوەشێنەوە و ژنمارەبڕین بوەستێنرێت و تەواوی فەرمانەکانی هەرێمەکانی جیهان کاریان پێ نەکرێت، تەنانەت تەواوی بوونەوەرانیش قەدەغەشکێنن، یان بڵێت پێشەوایەتی دروستە و فەرمانی هەرێمەکان کاریان پێ دەکرێت، بە هۆی ناچاری و دۆخی ئێستاوە، ئەوا سێ بژاردەی لە بەردەمە: یا ئەوەتا ڕێ لە ژنمارەبڕینی خەڵکی و کاروباری قازییەکان بگرێت، کە ئەمەش مەحاڵە و دەبێتە هۆی وەستانی تەواوی ژیان و گوزەران و فرەبیروڕایی، هەروەها گەل و کەسە عاقڵەکانیش بەرەو لەناوچوون دەبات، یاخود بڵێت با قازییەکان ژن مارە ببڕن و فەرمان دەربکەن، بەڵام قەدەغەشکێنن و بە هۆی پێویستیی دۆخەکەشەوە، کار بە لەڕێدەرچوون و بێباوەڕییان ناکرێت، یاخود بڵێین هەرچەندە پێشەوایەتیی مەرجەکانی لەدەست داوە، بەڵام کار بە فەرمانەکانی دەکەین، بە هۆی پێویستیی دۆخی ئێستاوە، ئاشکرایە دوور لە دوورترین نزیکترە، خراپییش لە خراپترین باشترە، بۆیە پێویستە کەسی عاقڵ خۆی سەرپشک بێت لە هەڵبژاردندا[1].

بەکورتی، پرۆفیسۆر دەیڤد دو سەنتیلانا دەڵێت: سوننەکان

---

[1] السیر توماس أرنولد و ألفرد غولوم، *تراث الإسلام*، ص ٢٠٢.

درکیان بەوە کردبوو، کە بەرنامەی ئایدیالی، بەرنامەیەکی زۆر کۆشندەیە و بەکەڵکی ژیانی پراکتیکی نایەت، هەر بۆیە لەسەر ئەوە کۆک بوون، کە خەڵکی تا هەنووکە فەرزاری حکومەتن، بەوەی وابەستە بن پێیەوە و متمانەی پێ ببەخشن، تەنانەت ئەگەر ئەو حکومەتە ڕەچاوی فەرمانە خوداییەکانیش نەکات و لەسەر بنەمای توندوتیژییش دامەزرابێت، چونکە بە سادەیی و ڕوونی ئەم دەستەیە دژی بێسەرەوبەرەیی و ڕێگریشە لە توندوتیژیی تاکەکەسی، ئەمەش ئاشتیی کۆمەڵایەتی فەراهەم دێنێت، کە ئەمەش ئامانجی شەریعەتە[1].

بەلام باڵەکەی دیکەی سوننە، ئەوانەی وەک دەر دەکەوێت خاوەن ڕەوتێکی واقیعیی گەورەن، هەوڵیان نەداوە لە ڕێی پیانووگەلێکی ئایینییەوە واقیعیبوونەکەیان بشارنەوە، وەک باڵی یەکەم کردیان، ئەوان ڕاشکاوانە دەڵێن، هێز تاکە ئامرازە کە لەمیانەیەوە کۆڵەکەکانی حکومەت دەچەسپێن، لەبەر ئەوە، هەرکەسێک توانای پێویستی هەبێت بۆ گەیشتن بە دەسەلات، مافی ئەوەی هەیە خەڵکی فەرمانبەرداری بکەن، بە چاوپۆشین لە تەواوی شتەکانی دیکە. ئەو بەها ڕووتەی خاڵییە لەو هێزەی پالپشتیی دەکات، لە ڕوانگەی ئەم باڵەوە جگە لە تۆزوخۆڵ، چیی دیکە نییە.

ئەمە جەوهەری تیۆریی ئیبن خەلدوونە، کە هەوڵی داوە لەژێر ناوێکی شیاوتردا ڕاڤەی بکات، ئەویش دەمارگیریی یان ڕۆحی خێڵە، لەوە دڵنیا نین کە مەبەستی ئیبن خەلدوون

---

[1] السیر توماس أرنولد و ألفرد غولوم، *تراث الإسلام*، ص ۲۰۱. شەریعەت لە زمانی عەرەبیدا واتا یاسای خودایی.

لە دەمارگیر، هێزی رووتە. لە کۆمەڵگەی سارانشینیدا، کە ئیبن خەلدوون تەواوی داتاکانی لێوە کۆ کردوتەوە، رۆحی خێڵ یان دەمارگیری، جگە لە هێزی کۆمەڵایەتی کە چەند کەسێکی وەک سەرۆکی خێڵ (شێخ) هەژموونیان بەسەریدا کردووە بۆ گەیشتن بە دەسەڵات، چیی دیکە نییە. بە بۆچوونی ئیبن خەلدوون، ئایین بێ دەمارگیری مەحاڵە، هەروەها لای ئیبن خەلدوون، ئەو کەسە باوەردارانەی بە بەهای رووت ئامۆژگاریی خەڵکی دەکەن، بێ ئەوەی خاوەن ئەو دەمارگیرییە بن کە پاڵپشتیان دەکات، ئەوانە شێتن[1].

لەمەوە کە باسمان کرد، هیچ شتێک بێ دەمارگیری نابێت، لە فەرموودەی سەحیحیشدا هاتووە: "خودا هیچ پێغەمبەرێکی نەناردووە، بێ هێز و شکۆ لەناو نەتەوەکەیدا." ئەگەر پێغەمبەران شاوا بووبن کە لە پێشێلکردنی سوود و دەستکەوتەکاندا لەپێش هەموو خەڵکییەوەن، ئەی سەبارەت بە خەڵکی دیکە چی[2].

ئیبن خەلدوون تاکە بیریاری سوننە نییە، کە پارێزگاریی لە حکومەتی زۆردار کردووە لەسەر بنچینەی هێزی رووت[3]. پێویستە لێرەدا ئەوە روون بکەینەوە، کە ئیبن خەلدوون تاکە کەس بووە هەوڵی داوە لەسەر بنەمای سۆسیۆلۆژی و مێژوویی، تیۆرییەکەی روون بکاتەوە، بێ ئەوەی بایەخێکی زۆر بە نموونە باڵاکانی ئایین بدات.

---

١ إبن خلدون، *المقدمة*: ص ١٥٩-١٦١.

٢ إبن خلدون، *المقدمة*: ص ١٥٩، طبعة إحياء التراث العربي بيروت.

٣ دوایت دونالسون، المصدر السابق: ص ٢٢٨. أ. ت. أرنولد، بند (الخليفة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني، ص ٨٨٥.

بە هەرحاڵ، ئیبن خەلدوون و شوێنکەوتووەکانی، لەنێو شوێنکەوتووانی سوننەمەزهەبدا زۆر دەستڕۆیشتوو نەبوون. لە واقیعیبوونیاندا زێدەڕۆ بوون و بایەخی ئایدیالییان لە ژیانی کۆمەڵایەتیدا بە پلەیەک پشتگوێ خستووە، لەوانەیە بڕوادارە سوننەکانیان لە خۆیان کردبێتە دوژمن. وەک ماتیوس ڕوونی دەکاتەوە، ئایدیالیزم نزیکییەکی لەگەڵ بڕواداریی ئایینییەوە هەیە[1]. لەبەر ئەوە، جێی سەرسووڕمان نییە کە باڵی واقیعیی پەڕگیریی سوننە، ژمارەیەکی کەم شوێنکەوتووی هەیە و لە ڕاستییشدا کاریگەرییەکی زۆر کەمیشی هەیە.

کاتێک بەوردی سەرنج لە زۆرینەی سوننە دەدەین، ئەوانەی دەکەونە ناوەندی ئەم دوو باڵە پەڕگیرەوە، دەبینین واقیعیبوونی خۆیان لەسەر چەند بانگەشەیەکی ئایینی بونیاد ناوە.

شاخت، لەسەر ئەم هەڵوێستە میتۆدێکی باشمان پێ دەبەخشێت، کاتێک جیاوازیی ئەو یاسا فیعلییانە تاوتوێ دەکات، کە لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا لە شەریعەتەوە وەر گیراون و دەڵێت:

فەقیهەکان لەژێر فشاری ڕاستییەکاندا، دەیانزانی پراکتیزەکردنی شەریعەت لە تەواوی بارودۆخەکاندا ئەستەمە[2]، تەنانەت ئاگریەستیشیان لەگەڵ دەسەڵاتی عەلمانیدا، لەسەر ئەم بنەمایە بوو. شتێکی دروست نییە تەواوی مسوڵمانان

[1] سایلر ماثیوس و جیرالد بیرني سمیث، معجم الدین و الأخلاق: ص ٢١٦.

[2] ج. شاخت، بند (الشریعة)، موسوعة الإسلام، المجلد الرابع: ص ٣٢٣.

بە خراپەکار و بیدعەکار ناوزەد بکەین، بە هۆی ئەوەوە کە بەردەوام ڕێساکان پێشێل دەکەن، ئەگەر ئامادە نەبن بە شێوەیەکی تەواوەتی پاشەکشە لە جیهان بکەن، بەڵکوو بە پێچەوانەوە، پێویستە ئەم کاروبارانە وەک ڕێککارییەکی خودا و ویستی ئەو وەر بگرین[١].

لە ڕاستیدا چەندین شت هەڵبەستراون، تەنانەت هەندێک جار خراونەتە پاڵ خودی پێغەمبەریش، بەزاندنی سنووری خودا ڕۆژبەڕۆژ لە زیادبووندایە[٢] و خیلافەتیش دوای مردنی پێغەمبەر، دەکەوێتە دەست پادشایەکی ستەمکارەوە[٣]. بەمەش، ڕەوتی دونیایی بۆ حکومەت ڕێپێدراو دەبێت بۆ ئەهلی سوننە، چونکە لەگەڵ وتەی پێغەمبەردا دەگونجێت، کە دەفەرموێت: "**ئەو کەسەی فەرمانبەرداریی من بکات، فەرمانبەرداریی خوای کردووە، ئەوەشی فەرمانبەرداریی پێشەواکان بکات، فەرمانبەرداریی منی کردووە، ئەوەشی لێم یاخی ببێت، لە خوا یاخی بووە، ئەوەشی لە پێشەواکان یاخی ببێت، لە من یاخی بووە**[٤]".

لێرەدا پێویستمان بەوەیە باس لە خاڵێکی گرنگ بکەین، کە پێمان وایە پەیوەندییەکی بەهێزی بە واقیعگەراییی سوننەوە هەیە، ئەویش باوەڕی کۆدەنگییە لای ئەهلی سوننە[٥]. ماکدۆناڵد دەڵێت:

١ هەمان سەرچاوە.
٢ أ. ت. أرنولد، بند (الخلافة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني، ص ٨٨٤.
٣ يحيى أبو يوسف، *كتاب الخراج*، المقدمة.
٤ هەمان سەرچاوە، *المقدمة*، ط١، المطبعة الميرية بولاق، ١٣٠٢هـ.
٥ روبن ليفي، *سوسيولوجيا الإسلام*، المجلد الأول، ص ٢٥٤.

> لەبەر ئەوەی ئەم کۆدەنگییە لە کۆبوونەوەیەک، یاخود (سنەودەس[1])ەوە نەبووە، بەڵکوو بە شێوەیەکی ڕەمەکی و خۆکردییەوە پێی گەیشتوون، بۆیە کۆدەنگییان لەسەر هەر خاڵێک، لەمیانەی گەڕانەوەوە دەبێت بۆ دواوە، تا بزانن ڕێککەوتنی لەو شێوەیە رووی داوە؛ لەبەر ئەوە بە شێوەیەکی هۆشیارانە پەسەندە و بە کۆدەنگی ناوی دەبەن... دەشتوانرێت لەمیانەی قسە و کردەوەوە یان لە میانەی بێدەنگییەوە، کە یەکێکە لە شێوەکانی قایلبوون، گوزارشتی لێ بکرێت[2]...

پێمان وایە ئەم بڕوایە دەلالەت لە ڕەوتی واقیعیی ئەهلی سوننە دەکات. بەراستی ئەو زەوییە بەپێتەیان بۆ فەراهەم دێنێت، کە دەتوانن لەمیانەیەوە بیانوو بۆ فەرمانبەرداریی تەوایان بۆ حکومەتە جیاوازەکانی ئیسلام بهێننەوە. سوننەکان وای دەبینن، هەموو خەلیفەیەک جێگرەوەی شەرعی پێغەمبەرە، جا خراپەکار بێت یان ستەمکار، بە پێچەوانەی ئەمەشەوە، شۆرشیان دژی ئەم جۆرە خەلیفانە بەرپا کردووە. بەپێی بۆچوونی ئەهلی سوننە، پێغەمبەر دەفەرموێت: "ئومەتەکەم لەسەر گومڕایی کۆدەنگ نابن[3]." لەبەر ئەوە، هەرشتێک لە مێژووی ئیسلامدا رووی دابێت - جا سیاسی بووبێت

---

۱ سنەودەس: کۆدەنگی کڵێسا یان ئەوەی مسوڵمانان بە دەستەی زانایان یان فەقیهەکان ناوی دەبەن. (ماجید شێر)

۲ د. ب. ماکدونالد، بند (الإجماع)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٤٤٨.

۳ المصدر نفسه، عبدالقادر المغربي، *الأخلاق و الواجبات*، ص ١٢٤.

یان ئایینی - بەڕای ئەمان دروستە، واتا هەولیان نەداوە ڕێڕەوە ڕەسەنەکەی مێژوو بگۆڕن. بەلام شیعە ئایدیالییەکان لە ڕووی هزری و جەستەییەوە هەولێکی زۆریان داوە تا مێژوو بە ئاڕاستەی ئەو نموونە بالایانەدا بەرن، کە خۆیان بڕوایان پێیان هەیە، بەلام شکستیان هێناوە، لەبەر ئەوە، ئێستا بە ئارامگرییەکی زۆر و ئاواتێکی ڕوونەوە چاوەڕوانی ڕزگارکەرەکەیان (پێشەوا مەهدی) دەکەن، تا زەوی پڕبکات لە دادگەری، دوای ئەوەی لێوانلێو بووە لە ستەم و زۆرداری[1].

١ محمد مهدي الكاظمي، *خصائص الشيعة*: ص ٤٩٦-٤٩٧. أحمد أمين، (المصدر السابق)، المجلد الثالث: ص ٢٣٥ و دواتر.

تا ئەو کاتەی پێغەمبەر لە ژیاندا مابوو، پرسی کۆکردنەوەی هەردوو دەسەڵاتی ئایینی و سیاسی، هیچ کێشەیەکی مەترسیداری نەوروژاند، بەڵام هەر کە کۆچی دوایی پێغەمبەر ڕاگەیەنرا، ئەم پرسیارە سەری هەڵدا: کێ ڕابەرایەتیی ئایینی و سەرۆکایەتیی دەوڵەتی ئیسلامی لە جێگەی ئەو دەگرێتە دەست؟

زۆرینەی ئەو مێژوونووسانەی لە پرسی سەرهەڵدانی مەزهەبەکانی ئیسلامیان کۆڵیوەتەوە، کۆکن لەسەر ئەوەی خاڵی سەرەکیی ناکۆکیی سوننە-شیعە بریتییە لە بابەتی خیلافەت دوای پێغەمبەر محەمەد[1].

لەوانەیە لێرەدا جێی بایەخ نەبێت ناوی ئەو کەسانە بهێنین، کە شایانی خیلافەت بوون، بە ڕای هەریەک لە شیعە و سوننە. ئەوەی گرنگە، ئەو ڕێگەیە کە هەریەکە لەم دوو گروپە دەیگرنە بەر بۆ دیاریکردنی جێنشینی ڕاستەقینەی پەیامبەر.

بە ڕای ئەهلی سوننە - وەک ئەمیر عەلی ئاماژەی پێ

---

١ ر. نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ١. أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ٢٧١. أمیر علي، *روح الإسلام*: ص ٤٦٤. درویش مقدادي، *تاریخ الأمة العربیة*: ص ٢. م. ف. الجمالي، *العراق الجدید*: ص ٨٨. دوایت دونالسون، *المذهب الشیعي*: ص ١٩.

دەکات - هەڵبژاردنی خەلیفە لە ڕێگەی هەڵبژاردنی میللی (کودەنگی)یەوە دەبێت[1]. لە کاتێکدا شیعە پێی وایە خەلیفە هاوشێوەی پەیامبەر لە ڕێی سروشەوە دیاری دەکرێت. ئیبن خەلدوون دەڵێت:

> بە ڕای شیعە، خیلافەت بەرژەوەندییەکی گشتی نییە، تا گەل بڕیاری لەسەر بدات و ئەوان خەلیفە دیاری بکەن، بەڵکوو پایەیەکی ئایینی و ڕێسایەکی ئیسلامە و ناکرێ پەیامبەر پشتگوێی بخات و بدرێتە دەست گەل، بەڵکوو پێویستە پێشەوایەکیان بۆ دیاری بکرێت، کە تاوانی گەورە و بچووکی ئەنجام نەدابێت و بێتاوان بێت[2].

دەتوانین لەوەوە کە باس کرا، بگەینە ئەو دەرئەنجامەی ناکۆکیی نێوان ئەم دوو گروپە، هاوشێوەی ئەو ناکۆکییەیە کە لەنێوان دیموکراسیەت و بڕوای مافی خوداییدا هەیە، زۆرێک لە خۆرهەڵاتناسەکانی وەک دوزی و براون و گۆبینۆ، ئاماژەیان پێ داوە[3]. سەرباری ئەمەش، ئەمانە هەوڵیان داوە دیموکراسیەتی سوننە بگێڕنەوە بۆ سروشتی عەرەبی سارانشین، کە مەزهەبی سوننە لەنێویاندا سەری هەڵداوە، لە کاتێکدا مافی خوداییبیان لای شیعە گێڕاوەتەوە بۆ پابەندبوونیان بە فارسەوە، دوزی دەڵێت:

> سەرەڕای ئەوەی زۆر جار شیعە خۆیان لەژێر

---

١ أمير علي، *روح الإسلام*، ص ٤٦٤.

٢ إبن خلدون، *المقدمة*: ص١٩٦. أحمد أمين، المصدر السابق: ص ٢٦٧.

٣ إدوارد ج. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٣٠. أ. أ. نيكولسن، سەرچاوەی پێشوو: ص ٢١٤. أحمد أمين، سەرچاوەی پێشوو: ص ٢٧٧. س. هيورات، بند (علي)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢١٤.

فەرمانی ئەو سەرکردە عەرەبانەدا بینیوەتەوە کە بەکاریان هێناون تا بە مەبەستە کەسییەکانی خۆیان بگەن، بەڵام سەرەڕای ئەوەش، ئەوان لە بنەچەدا مەزهەبێکی فارسی بوون، بەدیاریکراوییش لێرەدا ناکۆکیی نێوان ڕەگەزی عەرەبی ئازاد و ڕەگەزی فارسی ڕاهاتوو لەسەر کۆیلایەتی، بەڕوونی دەر دەکەوێت[1].

**بە ڕای ئێمە، ناکۆکیی نێوان سوننە و شیعە، ناکۆکی نییە لەنێوان دیموکراسیەت و بڕوای مافی خوداییدا، وەک بە ڕووکەش دەر دەکەوێت، بەڵکوو ناکۆکییە لەنێوان ڕیالیزم و ئایدیالیزمدا. سوننەکان پرنسیپی دیموکراسییان وەک داپۆشەرێک بۆ هەڵوێستە واقیعییەکەیان بەکار هێناوە بەرامبەر پرسی فەرمانڕەوایی، لە ڕاستیدا ئەوان بەدرێژاییی مێژووی دوورودرێژی خیلافەت، جارێک یان دوو جار نەبێت، پەنایان نەبردووەتە بەر دەنگدانی ئازاد، بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە، زۆرینەی هەرە زۆری خەلیفەکانیان لەلایەن پێشینەکانیانەوە دانراون، یاخود لە ڕێگەی هێزەوە بە دەسەڵات گەیشتوون.**

ئەرنۆلد دەڵێت:

> لە ڕێی وەرگرتنی بەیعەت لە پیاوماقووڵ و قازییەکان و دواتریش خەڵکی دیاری نێو گەلەوە، پارێزکاری لە ئالیەتی هەڵبژاردنی خەلیفە کراوە[2].

ئاشکرایە سوننەکان پێیان وایە تەنها دانیشتنی خەلیفە لەسەر عەرش، دەلالەت لە هەڵبژاردنی ئازادانەی دەکات

---

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ٢١٤.

٢ ت. و. آرنولد، بند (الخليفة) موسوعة *الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٨٨٤.

لەلایەن خەڵکەوە، خۆ ئەگەر دژی بوونایە، ئەوا لەبەرامبەری دەوەستانەوە. ئا ئەمەیە کە پرنسیپی کۆدەنگی لای ئەهلی سوننە پاڵپشتیی دەکات. لە ڕاستیدا چەند فەقیهێکی سوننە ڕاشکاوانە باسیان لەوە کردووە، کە دەتوانرێت خیلافەت لە ڕێی هێز و زۆرەملێییەوە بەدەست بهێنرێت[1].

لە لایەکی دیکەوە شیعەکان گاڵتە بەم لۆژیکە واقیعییە دەکەن. شیعەکان وای دەبینن، کە پێویستە خەلیفە بێتاوان بێت و لەنێو ئەهلی ئیسلامدا باشترین بێت. لەبەر ئەوە، هەر دەبێت لەلایەن خوداوە دیاری بکرێت، چونکە تەنها خودا دەزانێت کێ بێتاوانە و باشترینە لەنێو مسوڵماناندا[2]. لەبەر ئەوەشی خودا خاوەن بەزەییە بەرامبەر خەڵکی و لە خودی خۆشیان باشتر دەیانناسێت، هەر بۆیە لە هەمووان لەپێشترە تا خەلیفەیان بۆ دیاری بکات، هەمان ئەو پێویستییەی لەپێتاویدا خودا پەیامبەرەکانی ناردووە تا مژدە بە خەڵکی بدەن و ئاگاداریشیان بکەنەوە، بۆ خەلیفەیش دروستە. ئەگەر هەڵبژاردنی خەلیفە بۆ خەڵکی جێ بهێڵرێت، دەشێ باشترین بخەنە پشتگوێ و پەسەندکراو بەسەریاندا بسەپێنرێت[3].

شیعە ئایدیالییەکان لەم ڕوانگە ئایدیالییەوە مشتومڕ لەگەڵ برا سوننەکانیاندا دەکەن، زۆرینەی مشتومڕەکەشیان دەربارەی پرسی خیلافەت، لەسەر هێلکەلێکی لۆژیکی و غەیبی دەڕوات، تەنها بایەخێکی کەم بەوە دەدەن، کە بە فیعلی لەسەر ئەرزی واقیع ڕووی داوە. شیعەکان پێیان وایە هەر دەبێت

---

١ سەرچاوەی پێشوو، دوایت دونالسون، *المذهب الشیعي*، ص ٢٢٨.
٢ محمد باقر المجلسي، *حیاة القلوب*، المجلد الثالث، ص ٣٩ و دواتر.
٣ هەمان سەرچاوە.

خەلیفە لە تەواوی وردەکارییەکانی کەسێتییەکەیدا، کەسێکی کامڵ بێت[1]. ئەوان گفتوگۆ لەسەر ئەو پرسە ناکەن، کە تا چەند دەکرێ ئەمە لە ژیانی واقیعیدا ڕوو بدات، تەواوی گفتوگۆکەیان لەسەر بنەمای ئەو لۆژیکە ڕوونە دامەزراوە، کە لە قورئان و سوننەتدا دەریان هێناوە.

ئەمەش تراویلکەی (فەیلەسووفی-پادشا)مان بیر دەخاتەوە، کە هەریەک لە ئەفلاتوون و کونفوشیوس و فارابی و چەندین فەیلەسووفی دیکە، بەدرێژایی مێژوو، باسیان لێوە کردووە.

کتێبی *کۆمار*ی ئەفلاتوون، کە تیایدا بەڕوونی باس لە پرسی فەیلەسووفی-پادشا دەکات، لە سەدەی دووەمی کۆچیدا کراوەتە عەرەبی[2]، بێگومان کاریگەریی هەبووە لەسەر بیرکردنەوەی مسوڵمانان. فەیلەسووفی گەورەی ئیسلامی، فارابی، کە لە سەدەی سێیەمی کۆچیدا ژیاوە، وەک فۆکس ئاماژەی پێ دەدات، بە ئەفلاتوون کاریگەر بووە[3]. فارابی کتێبێکی نووسیوە، تیایدا باس لە ڕێکخستنی شاری چاک دەکات و دەڵێت، پێویستە پادشای شار فەیلەسووف بێت و تەواوی تایبەتمەندییە مرۆیی و داناییەکانی تێدا بێت، پادشا لای فارابی (ئەفلاتوونە لە بەرگی پێغەمبەر محەمەددا)[4].

**ئەم لێکچوونەی نێوان خەلیفە لای شیعە و فەیلەسووفی-پادشا لای ئەفلاتوون و فارابی، یارمەتیمان دەدات بڵێین، هەردوو نموونەکە بەرهەمی بیرکردنەوەیەکی ڕووتی دوور**

---

١ محمد عبده، *نهج البلاغة*، المجلد الثاني، ص ١٩.

٢ ج. دو بور، *تأريخ الفلسفة في الإسلام*، ص ٢٨. أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول، ص ٢٧٨.

٣ دو فوكس، بند (الفارابي)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني، ص ٥٤.

٤ ج. دو بور، *تأريخ الفلسفة في الإسلام*، ص ١٥١.

لە سیاسەتگەلی واقیعین.

مامۆستا ئەحمەد ئەمین بڕوای بێتاوانیی پێشەوا لای شیعە دەگێڕێتەوە بۆ دوو هۆکار، ئەوانیش:

**یەکەم:** پێشەوایانی شیعە[1] بۆ ماوەیەکی کەم نەبێت، بە شێوەیەکی کردەیی فەرمانڕەواییان نەکردووە، بەڵکوو بەردەوام چەوسێنراونەتەوە، بەڵام سوننەکان هەمیشە لە فەرمانڕەواییدا بوون، هەر بۆیەش هەڵە و لەرێلادانەکانیان لای خەڵکی ئاشکرا بوون.

**دووەم:** خەلیفەکانی سوننە، لە سەرەتای مێژوویاندا، بە شێوەیەکی سەرەکی بە عەرەب دەورە دراون، کە لەهەمبەر سەرکردەکانیاندا خاوەن هەڵوێستی دیموکراسی بوون، لە کاتێکدا زۆرینەی شیعەکان لەو کاتەدا فارس بوون، کە ڕاهاتوون پادشاکانیان لەو کەسانە بن، کە خاوەن کەسێتیی خواوەندی بنەچەیەکی ئەرستۆکراتی بن[2].

لەوانەیە ئەحمەد ئەمین، لە خستنەڕووی خاڵی دووەمدا، بە دۆزیی خۆرهەڵاتناس، کاریگەر بووبێت، چونکە دۆزی پێی وایە شیعە لە بنەڕەتدا مەزهەبێکی فارسییە، زۆرێک لە خۆرهەڵاتناسەکان ناکۆکیی سوننە و شیعە لەسەر بنەمای جیاوازیی ئێتنی یان نەتەوەیی وەسف دەکەن، دەشێ بە جۆرێک لە جۆرەکان ئەوە ڕاست بێت، بەڵام خاڵی گرنگ

---

1 لێرەدا پێویستە ئاماژە بەوە بکەین، کە شیعە بە خەلیفەکانیان دەڵێن پێشەوا (الإمام)، لەوەیە ئەم ناونانە دەلالەت لەوە بکات، شیعەکان لە سوننەکان کەمتر واقیعین، سوننەکان وشەی خەلیفە (خليفة) بەکار دێنن بۆ ئەو کەسەی جێگەی پێغەمبەر دەگرێتەوە. سەیری (ج. والش. سوسیولوجیا الدین: ص ٣٠٥) بکە.

2 أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الثالث، ص ٢٢٦ و دواتر.

کە لێی بێئاگا بوون و ئێمەش دەمانەوێت لەم توێژینەوەیەدا جەختی لێ بکەینەوە، ئەوەیە ناکۆکیی سوننە و شیعە، بەرئەنجامێکی کۆمەڵایەتییە، نەک ئێتنی. ڕاستە زۆرینەی فارس شیعەن، وەک خۆرهەڵاتناسەکان جەختی لەسەر دەکەنەوە، بەڵام ئەو پرسە گرنگەی پێویستە لێرەدا باسی لێوە بکەین، ئەوەیە فارسەکان تەنها لەبەر ئەوەی فارسن، بەمەی ئێستا نەگەیشتوون. هەموو نەتەوەیەک، جا فارس بن یان عەرەب، ئەگەر لەژێر هەمان ئەو دۆخە کۆمەڵایەتییەدا بن کە شیعەکان وەک گروپێکی کۆمەڵایەتی پیایدا گوزەریان کردووە، هەوڵ دەدەن هەمان شت بکەن، وەک دواتر دەیبینین. ئەو ڕاڤەکردنە ئێتنییە مێژووییەی زۆرێک لەمیانەی سەدەی نۆزدەدا جەختیان لەسەر کردۆتەوە، هەنووکە ڕاست نین، پێدەچێت دۆزی و شوێنکەوتووەکانی بە هەمان تیۆری کاریگەر بووبن، لەبەر ئەوە، زۆر جار دەبینین زۆر ڕووداوی مێژووی ئیسلام لە ڕوانگەیەکی ئێتنییەوە ڕاڤە دەکەن[1].

بە ڕای ئێمە، سوننەبوون خەسڵەتێکی تایبەت نییە بە ڕەگەزی عەرەبی، بەڵکوو یەکێکە لە خەسڵەتەکانی کولتووری سارانشینی، تەواوی ئەو سارانشینانەی هاتوونەتە نێو ئیسلامەوە، جا عەرەب بووبن یان تورک یان بەربەر، سوننەن. وا دیارە ئەو سارانشینانەی - ئارەزووبان لە دڕندەیی و پاڵەوانێتییە - ناتوانن بەرگەی مەیلی خۆبەدەستەوەدان و ملکەچیی شیعە بگرن. شیعەگەری

---

١ ڕینۆلد نیکۆلسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ٢١٤. ی. براون، *تاریخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٣٠ و دواتر. أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ٢٧٧.

تەنها لە وڵاتە کشتوکاڵییەکاندا هەیە، وەک عێراق، فارس، ئەحسا[1] و هیندستان. سەرنجی ئەوەشمان داوە، ئەو وڵاتە کشتوکاڵییانەی نەچوونەتە ژێر باری شیعەوە، هۆکارێکی خێرای لەپشتەوەیە، ئەویش کاریگەربوونیانە بە سۆفیگەری، کە لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە زۆر لە شیعەگەری دەچێت، وەک دواتریش دەیبینین.

تەواوی سارانشینەکان لە وڵاتە عەرەبییەکاندا، وەک جەمالی دەڵێت، سەر بە مەزهەبی سوننەن. ئەگەر سەیری عێراق بکەین، دەبینن زۆرینەی خێڵەکان باوەشیان بۆ شیعە کردۆتەوە. تەنانەت زۆرینەی خێڵەکانی ئەمڕۆی فوراتی ناوەند و خواروش، هەروەها خێڵەکانی سەر کەناری ڕووباری دیجلە لە باشووری بەغداد بە ئاراستەی کەنداو، هەر شیعەن[2].

ژنە توێژەری بەناوبانگ لە کاروباری کولتووریی عەرەبی، خاتوو جیرترود بێل، ئاماژە بە هەمان خاڵ دەکات و دەڵێت: سارانشینەکان زیاتر لە جووتیارە جێگیرەکان، مەیلیان لەوەیە بە پرنسیپی سوننەوە پەیوەست بن[3].

ئەو دەرئەنجامەی دەمانەوێت لێرەدا بەخێرایی و بەکورتی باسی لێوە بکەین و دواتر بەدوورودرێژی دەگەڕێینەوە سەری، خەسڵەتی ئیتنی فارس نییە، بەڵکوو بەرئەنجامی پەرچەکرداری کردەی کۆمەڵایەتیی خەڵکی ناو ئیمپراتۆریەتی

---

١ ئەحسا (الأحساء): هەنووکە یەکێکە لە شارەکانی سعودیە و دەکەوێتە باشووری خۆرهەڵاتی ئەو وڵاتەوە و بە دەروازەی دەوڵەتانی کەنداوی عەرەبی هەژماردەکرێت. (و. ک.)

٢ محمد فاضل الجمالي، *العراق الحديث*: ص ٨٨.

٣ *بريطانيا العظمى*، تقرير الإدارة المدنية لبلاد مابين النهرين: ص٣٧.

ئیسلامییە بەرامبەر فەرمانڕەواکانیان. دەتوانین ململانێی سوننە-شیعە وەک قۆناغێک لە قۆناغەکانی ململانێی هەژمار بکەین، لەنێوان بیابان و زەویی کشتوکاڵیدا. ئەو ڕەوتە ئایدیالییەی لەنێو شیعەکاندا هەیە، دەتوانین لەنێو چینە ستەملێکراوەکانی هەر کۆمەڵگەیەکی دیکەشدا بەدیی بکەین، بەتایبەت لەنێو ئەو جووتیارانەدا، کە چەند گروپێکی درندە دەیانچەوسێننەوە. کارل برینکمان دەڵێت: "خاوەندارێتیی زەوی، پەیوەستە بە نزمترین پێگەی کەسێتییەوە لە ئازادیی مرۆڤایەتی و بالاترین ئایدیالەکانی مرۆڤ و ئاواتە کۆمەڵایەتییەکانی[1]"

بڕوامان وایە دەتوانین تیۆریی یاخیبوون لای شیعەکان لە دەرچەکەلی کۆمەڵایەتییەوە ڕاڤە بکەین. کۆمەڵناسی شۆڕشەکان، ئیدواردز، ئاماژە بەوە دەکات، چینە ستەملێکراوەکان هەندێک جار ستەمی کۆمەڵایەتی و دەردەسەری دەگێڕنەوە بۆ ئەو ڕاستییەی خراپەکارەکان فەرمانڕەوایی دەکەن، خۆ ئەگەر تەنها ئەم فەرمانڕەوایانە بگۆڕدرێن بە کەسانی چاکەکار، ئەوا هەموو شتێک باش دەبێت[2]. ئەمە ڕای زۆرێک لە بیریارە مسوڵمانەکان و تەنانەت خودی پێغەمبەریشە، وتراوە ئەویش گوزارشتی لە هەمان ئەم هزرانە کردووە[3].

وا دەر دەکەوێت ئەو شیعانەی نوێنەرایەتیی چینە ستەملێکراوەکان دەکەن، لەنێو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا،

---

١ کارل برینکمان، بند (حیازة الأرض)، *موسوعة العلوم الإجتماعیة*، المجلد الرابع: ص ٧٥.

٢ ل. ب. أدواردز، *التاریخ الطبیعي للثورات*: ص ٤٤-٤٥.

٣ روبن لیفي، *سوسیولوجیا الإسلام*، المجلد الثاني: ص ١٦٨.

**تەنها بۆ ئەوە تیۆریی پاخیبوونی میللەتیان هێناوە، وەک پەرچەکردارێک دژی ئەو ستەمەی لەلایەن خەلیفە سوننەکانەوە بەسەریاندا سەپێنراوە.** بێدەچێت مامۆستا ئەحمەد ئەمینیش بڕیار لەسەر ئەمە بدات و دەڵێت: پاخیبوونی میللەت، یەکێکە لەو ڕێگەیانەی شیعە بوونیادی ناوە تاکوو تا ڕادەیەک خەڵکی بەرەو شۆڕش هان بدات دژی ئەو ستەمەی هەندێک لە خەلیفەکانی سەرەتا بەسەریاندا سەپاندوون[1].

ڕاستە بەشێک لە شیعەکان پێیان وایە میللەتەکەیان نە تەنها بێتاوانن، بەڵکوو خاوەن سروشتێکی خوداییشن. بە بڕوای ئێمە، دەتوانرێت هەمان ئەم هەڵوێستە لای تەواوی ئەو چینە ستەملێکراوانەش بەدی بکرێت، کە لە هەمان ئەو دۆخەدان، کە شیعەکان تێیدا دەژین.

لە بەشی شەشەمدا بەدرێژی باس لەم دیاردەیە دەکەین، هەروەها ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتییانەش دەخەینە ڕوو، کە لەپشتییەوە ئامادەبییان هەیە. ئەو خاڵەی لێرەدا لەسەری دەوەستین، تیۆریی دۆزییە دەربارەی پرنسیپی مافی خودایی لە مەزهەبی شیعەدا و دروستیی بنەچە فارسییەکەی.

بەپێی زانیاریی ئێمە، بەڵگەیەکی بەهێز لە بەردەستدا نییە پاڵپشتی لە تیۆرییەکەی دۆزی و شوێنکەوتووەکانی بکات. تاکە بەڵگەیەک کە بۆ پاڵپشتیی تیۆرییەکەیان دەیخەنە ڕوو، ئەوەیە ڕەچەڵەکی ساسانی وڵاتی فارس، بەر لە داگیرکاری عەرەبی، وەک بوونەوەری خودایی خۆیان هەژمار کردووە[2]. لە ڕاستییشدا ئەمە خەسڵەتێکە، تەنها پادشا ساسانییەکان

---

١ أحمد أمين، ضحى *الإسلام*، المجلد الثالث: ص ٢٣٤.

٢ ي. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٢٨.

خۆیان پێ جیا کردۆتەوە. ئێچ. جی. ویلز دەڵێت، پادشا ساسانییەکان "لەسەر تەرزی کۆن" ئەمەیان کردووە[1].

براون وای دەبینێت، کە "لەوانەیە هیچ وڵاتێک نەبێت، هێندەی وڵاتی فارس، بڕوای بە مافی خودایی پادشاکان بەهێزتر و بەربڵاوتر بێت، لە سەردەمی ساسانییەکاندا[2]." لەوانەیە کەسانێک لێرەدا بپرسن: "براون لەسەر چ بنەمایەک ئەم لێدوانە بەهێزە دەدات؟" ئەو چیرۆکەی براون دەیکاتە بنەمایەک بۆ لێدوانەکەی، جگە لە ڕووداوێک، کە دەکرێ لە هەر وڵاتێک، یان هەر ئیتنێکدا ڕوو بدات، چیی دیکە نییە. بەکورتی، چیرۆکەکە ئەمەیە: خانەدانێکی فارس بە ناوی بەهرام چوبین، کە سەر بە خانەوادەی پادشایەتی نەبووە، لە پادشایەکی ساسانی یاخی دەبێت. دواتر چوبین پاشەکشە دەکات و دواجاریش ڕادەکات. لە کاتی ڕاکردنیشیدا، لە ماڵی پیرەژنێک پشوو دەدات، بێ ئەوەی خۆی بە پیرەژنەکە بناسێنێت. لە کاتی قسەکردنیاندا، چوبین لەبارەی بەهرام چوبینەوە پرسیار لە پیرەژنەکە دەکات، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت، کەسێکی گەمژەی هیچوپووچە، لەگەڵ ئەوەشدا کە سەر بە خانەوادەی پادشایی نییە، بەڵام داوای پادشایەتی دەکات[3].

پێمان وایە خوێنەر هاوڕایە لەگەڵماندا، کە ئەم چیرۆکە بەڵگەیەک نییە لەسەر بیروڕای زۆرینەی فارسەکان دەربارەی مافی خودایی پادشاکانیان، وەک براون دەڵێت. تەنانەت

---

١ هـ. ج. ویلز، مختصر *التاریخ*، ص ٥٧٥.
٢ ي. براون، *تأریخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول، ص ١٢٩.
٣ هەمان سەرچاوە.

ئەحمەد ئەمینیش، کە حەز دەکات پاڵپشتی ڕاکەی براون بکات، بڕوای وا نییە ئەم چیرۆکە بەتایبەتی قەناعەتپێکەر بێت. ئەمین دەڵێت: "هەموو ڕەچەڵەکێک لە هەر نەتەوەیەک بێت، ئەگەر چەند نەوەیەکی یەک لەدوای یەک بەردەوام بێت لە حوکمڕانی، لە ئێروانینی خەڵکیدا ئەم جۆرە مافە لەلایەن گەلەوە بەدەست دەهێنێت"[1]. جێی سەرنجە دەبینین ئەحمەد ئەمین -لەپێناو ئەوەدا پاڵپشتی بۆچوونەکەی براون بکات- وەک بەڵگە، چیرۆکێکی لاوازتر لەوەی براون دەخاتە ڕوو[2].

لە ڕێی لێکۆڵینەوەمان لە فەرمانڕەوایی ساسانییەکان لە وڵاتی فارسدا، ئەوەمان بۆ دەر دەکەوێت، کە پادشا ساسانییەکان ئایینی زەردەشتییان کردووە بە ئایینی فەرمیی خۆیان، پیاوە ئایینییەکانی زەردەشتیش لەدوای پاشا، کەسی دووەم بوون لە دەوڵەتی ساسانیدا[3] - وەک کۆمەڵناسە ئایینییەکان ئاماژەی پێ دەدەن - ئەمە دەبێتە هۆی دەرکەوتنی بیدعە و هەرتەقەی جیاواز لەنێو چینە هەژارەکانی کۆمەڵگەدا، لە سەردەمی ساسانییەکانیشدا هەر ئەمە ڕووی داوە، لەژێر چەند ناوێکی وەک مانیزم، مەزدەکی، مەسیحیەت و چەندانی دیکەدا. پادشا ساسانییەکان بە شێوەیەکی زۆر دڕندانە ڕووبەڕوویان بوونەوە، بەدڵنیاییشەوە نەیانتوانیوە بە شێوەیەکی تەواوەتی بنەبڕیان بکەن. مانیزم لە مەسیحیەت دەچوو و مەزدەکیش لە دەروەگایەتی دەچوو و وەک پەرچەکردارێکی حەتمیی چینە هەژارەکان بوو دژی ئایینی

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ١١١.

٢ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ١١٢

٣ هـ ج. ويلز، *مختصر التاريخ*: ص ٥٧٥.

کەشیشی دەوڵەت، کە زەردەشتی بوو.

پرۆفیسۆر ئەرنۆلد ئەوە روون دەکاتەوە، کە نالێبووردەیی پیاوانی ئاینی زەردەشتی بەرامبەر خاوەن ئاینەکانی دیکە و تەنانەت بەرامبەر ئەو مەزهەبانەشی لە زەردەشتییەوە وەر گیرابوون، وەک مانیزم و مەزدەکی، وای کرد بە شێوەیەکی بەرفراوان و گەورە ناپەسەند بن و خۆشەویست نەبن، لەبەر ئەوە، ستەمکاری بووە هۆی سەرهەڵدانی هەستی رقێکی تاڵ لەنێو تاکەکانی دەوڵەتی ساسانیدا، دژی ئاینی فەرمی و ئەو رەچەڵەکە فەرمانڕەوایەی پاڵپشتی لە سەرکوتکردنەکانیان دەکرد، هەر ئەمەش وای کرد، فتوحاتی عەرەبەکان وەک رزگاربوون سەیر بکەن[1].

بەڵگەیەکی دیکەش هەیە پاڵپشتی ئەو تیۆرییە دەکات، کە خەڵکی ئاسایی فارس، پادشا ساسانییەکانیان بە خواوەند نەکردووە، یەکێک لەو جەنگانەی لەنێوان سوپای ساسانییەکان و سوپای عەرەبیدا لە عێراق رووی دا، بە (جەنگی خاوەن زنجیرەکان) ناو دەبرێت، چونکە سەربازانی فارس بە زنجیر بە یەکدییەوە بەسترابوون، تا رێگری لە راکردنیان بکەن لە شەرەکەدا.

دوو زانیاریی مێژوویی هەن، کە دەتوانن دیاردەیەکی جیاواز لە چیرۆکی بەهرام چوبین بخەنە روو، براون وای دەبینێت، کە رەنگدانەوەی رێزلێنانی فارسەکانە لە پادشا ساسانییەکانیان. ئەم زانیارییانەش ئەمانەن:

**یەکەم:** بەهرام چوبین بەسەر (هورمزی چوارەم)ی

---

١ درویش عقادي، *تاريخ الأمة العربية*: ص ١٤٥.

پادشای ساسانییەکاندا سەر کەوتووە[1]، بەڵام پادشا بە سوپایەکی یۆنانییەوە گەڕاوەتەوە و شەڕی لەگەڵ بەهرامدا کردووە و دووبارە پادشایی لێ سەندۆتەوە، پێمان وایە بەهرام هەواداری زیاتر بووە لەو پادشایەی لە ڕێی یارمەتیی کاسەلیسی دەرەکییەوە توانیی عەرشەکەی بەدەست بهێنێتەوە[2].

**دووەم:** یەکێک لەو ڕەچەڵەکانەی لەمیانەی هەردوو سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا فەرمانڕەوایەتیی فارسی کردووە، سەر بە ڕەچەڵەکی بەهرام چوبینە[3]. دەکرێ ئەم ڕاستییە ئاماژە بۆ ئەوە بکات، بەهرام کە لە پادشای ساسانی یاخی بوو، لەنێو خەڵکی وڵاتی فارسدا خاوەن هەوادارێکی زۆر بوو بێت، ئەگەر وا نەبێت، ئەوا کەس بانگەشەی ئەوە ناکات کە لە ڕەچەڵەکی ئەوە.

سەرباری ئەوەی باس کرا، دیاردەیەکی دیکەش لە کۆمەڵگەی فارسی ئەو کاتەدا هەبووە، ئاماژە بەوە دەکات، ڕەچەڵەکی ساسانی هەوادارییان نەبووە. کرامەرز دەڵێت، تەواوی چینە قوڵبڕەکان بە (کوڕانی ساسانی) ناو دەبران، لەمەشدا لەگەڵ نولدکەدا هاوڕایە، کە ئەم ناوە لە بنەچەدا دەگەڕێتەوە بۆ ئەو زنجیرە ڕاپەڕینانەی لە وڵاتی فارسدا

---

1 ي. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٢٩. أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ١١١.

2 *آرنولد و التبشير الإسلامي*، لندن، ١٨٩٦: ص ١٧٧-١٨٤. هەروەها لەلایەن براونیشەوە لە بەرگی یەکەمی کتێبی (*تاريخ الأدب الفارسي*) ئاماژەی پێ دراوە.

3 ي. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*: ص ٣٥٢.

دژی ساسانییەکان ئەنجام دراون[1].

- بەڕای ئێمە - دەتوانین ئەم هەڵوێستەی فارسەکان لەهەمبەر پادشا ساسانییەکانیان، بە هەڵوێستی خەڵکی ژێر دەسەڵاتی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بچووێنین. سروشتییە کەسانێک بەدی بکەین، کە سوودمەند بوون لە فراوانخوازییەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، وەک ئەفسەری سوپا، سەرباز، خانەدان و پیاوانی ئایینی دەوڵەت، بە ڕێز و شکۆوە لەو پادشایانە بڕوانن، کە ئەم ئیمپراتۆریەتەیان بونیاد ناوە، لە کاتێکدا دەبینین خەڵکی ئاسایی تەنها وەک ستەمکار و کۆکەرەوەی باج سەیری ئەو فەرمانڕەوایانە و دەستوپێوەندەکانیان بکەن. کەواتە جێی سەرسامی نییە ببینین ئایینەکان (ناتەقلیدییەکان) کە لەگەڵ ئایینی دەوڵەتدا یەک ناگرنەوە، وەک مەسیحیەت و مانیزم، لەنێو چینە هەژارەکانی ئەم ئیمپراتۆریەتەدا تەشەنەیان کردبێت.

هەمان شت لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامییشدا ڕووی داوە، وەک لە بەشەکانی داهاتوودا بەوردی دەگەڕێینەوە سەریان. - بەپێی ئەم لێکۆڵینەوەیە - سوننەکان تا ڕادەیەک ئەو کەسانەن، کە سوودێکی گەورەیان لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی وەر گرتووە، لە کاتێکدا شیعەکان چینە هەژارەکانی ئیمپراتۆریەتن، ئەوانەی جگە لە دانی باجی زۆر و پێگەیەکی نزم، چیی دیکەیان دەست نەکەوتووە.

---

[1] ج. هـ کرامرز، بند (ساسان)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثالث: ص ١٧٨.

دەتوانین سەرنجی ئەوە بدەین، ئەو بزووتنەوە نەتەوەییانەی بەم دواییانە لە ئیتالیا و وڵاتی فارس و وڵاتە عەرەبییەکاندا گەشەیان کردووە، بە شکۆ و ڕێزەوە سەیری ئیمپراتۆریەتە کۆنەکانی وەک ڕۆمانی، ساسانی و ئیسلامی دەکەن و هێزیان لێ وەر دەگرن بۆ بوونیادنانی سەرکەوتنە ئیستیعمارییە نوێکەی لەسەر هەمان ڕێڕەو.

دوژی و شوێنکەوتووەکانی لە سەردەمێکدا ژیاون، کە لێوانلێو بووە لە ڕۆحی ژیاندنەوەی نەتەوەیی و هۆشیاریی ڕەگەزپەرستی، بێگومان ئەوانیش بەم ژینگەیە کاریگەر بوون، لە بوونیادنانی هزرەکانیان سەبارەت بە ناکۆکی سوننە-شیعە بەتایبەت و مێژووی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی. ئەوان – وەک پێشتر ئاماژەمان پێ دا – هەوڵیان داوە تەواوی مێژووی ئیسلام، لە ڕوانگەیەکی ئیتنی یان ڕەگەزییەوە، شرۆڤە بکەن. زۆرێک لە مێژوونووس و نووسەرە عەرەبییەکان، لەم بوارەدا شوێنپێی ئەوانیان هەڵگرتووە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵ دەدەین بەرپەرچی ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە بدەینەوە و مێژووی ئیسلامیش لەبریی پرنسیپی ڕەگەزپەرستی، بەپێی پرنسیپەکانی کۆمەڵناسی، ڕاڤە بکەین.

ئەگەر بمانەوێت بە شێوەیەکی تەواو لە گرفتی ئیسلام و پەیوەندیی بە چینەکانی کۆمەڵگەی مسوڵمانەوە تێبگەین، پێویستە لە سروشتی سەرەتای ئیسلام بکۆڵینەوە.

وەک پێشتر باسمان کرد، ئیسلام سیستمێکی سیاسی-ئایینییە، بەڵام پێویستە لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە ئیسلام لەسەر ئەمە دروست نەبوو. لە ڕاستیدا سەرەتا ئیسلام وەک ئایینێکی ڕووت هات و بەدرێژاییی ئەو ماوەیەش کە پێغەمبەر لە مەککەدا بە ڕێگەی ئاشتییانە بانگەشەی دەکرد، لەسەر ئەمە بەردەوام بوو. دوای ئەوەی پەیامبەر لەگەڵ شوێنکەوتووەکانیدا کۆچی کرد بۆ مەدینە، گۆڕانکاری لە سروشتی ئیسلامدا دروست بوو، بەوەی یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی لەسەر گۆی زەوی دامەزراند. نیکۆلسن دەڵێت:

> محەمەد لە قۆناغە سەرەتاییەکانی بانگەوازەکەیدا نموونەیەکمان لەو مەزنییە پێشکەش دەکات، کە وا دەکات هاوسۆز بین لەگەڵیدا و پێشی سەرسام بین، وەلی لە مەدینە بە مەزنییەکی کەمترەوە دەر دەکەوێت، ڕۆژانی هەڵچوونی ئایینیی بێگەرد تێپەڕین و ناگەڕێنەوە و کەسێتیی پیاوی دەوڵەت، سێبەری بەسەر

کەسێتیی محەممەدی پێغەمبەردا کرد[1].

زۆرێک لە مێژوونووس و خۆرهەڵاتناسان، کۆکن لەسەر ئەوەی لەیەکچوونێکی گەورە لەنێوان مەسیحییەت و ئیسلامی مەککەدا هەیە، کە دەتوانرێت وەک پەرچەکردارێکی ئایدیالیییانەی چینە ستەملێکراوەکان هەژمار بکرێت، دژی ستەمکارانیان، یاخود وەک نیتچە بە (شۆڕشی کۆیلەکان) ناوی دەبات.

لە چەندین شوێنی قورئاندا ڕەخنەیەکی توند بەدی دەکەین لە خۆبەگەورەزانینی گاورەکان. لە کاتێکدا هەر لە قورئاندا چەند ئایەتێک هەن، کە ئاماژە بە جۆرێک لە ڕێزگرتنی نەسرانییەکان دەکات: (لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْۖ وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا وَأَنَّهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ)[2] واتا: (سوێند بە خوا دەبینیت سەرسەختترینی خەڵک لە دوژمنایەتیدا بەرامبەر ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، گاورەکان و ئەوانەن کە هاوەڵیان بۆ خودا داناوە سوێند بێت دەبینیت نزیکترینیان لە سۆز و خۆشەویستی بۆ ئەوانەی باوەڕیان هێناوە، ئەوانەن کە دەیانوت: بەڕاستی ئێمە نەسرانین، ئەوەش لەبەر ئەوەیە بەڕاستی هەندێک لەوان قەشەی دیندارن و هەندێکشیان گۆشەگیر و کەسانی خواپەرستن و بێگومان ئەوان خۆ بەگەورە دانانێن)[3].

---

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*، ص ١٦٩.

٢ سورة المائدة، الآية ٨٢.

٣ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، لە بڵاوکراوەکانی کتێبخانەی ڕوشنبیر، سلێمانی-هەولێر، ٢٠٠٤، لا ١٢١. (و. ک.)

زۆربینەی ئەوانەی لە سەرەتادا باوەڕیان بە ئیسلامدا کرد، لە چینە هەژارەکان بوون[1]، هەروەها "ئەو کۆیلانە بوون، کە هزرە بانگەشەکارەکانی ئیسلام بۆ یەکسانیی نێوان خەڵکی، بەکۆمەڵ بەلای خۆیدا پەکێشی کردن[2]" کاتێکیش ئەرستۆکراتەکانی مەککە دەستیان کرد بە چەوساندنەوەی شوێنکەوتووانی ئیسلام، محەمەد فەرمانی پێ کردن پەنا بۆ نەسرانییەکانی شانشینی حەبەشە بەرن، لەوێ مسوڵمانان پێشوازییەکی گەرمیان لێ کرا[3]. "لێرەدا محەمەد بڕوای وا بووە، بیروباوەڕی ئیسلامی و مەسیحی لە کرۆکدا یەکن[4]." کاتێکیش خەڵکی داوایان لێ کرد نزا بۆ لەناوچوونی بەشێک لە چەوسێنەرانی بکات، لە وەڵامدا وتی: "من وەک نەفرینکار نەنێردراوم، بەڵکوو وەک رەحمەت نێردراوم بۆ جیهان[5]." قورئان بەم شێوەیە وەسفی مسوڵمانانی چاکەکار دەکات: (وَعِبَادُ الرَّحْمَنِ الَّذِينَ يَمْشُونَ عَلَى الْأَرْضِ هَوْنًا وَإِذَا خَاطَبَهُمُ الْجَاهِلُونَ قَالُوا سَلَامًا)[6] واتا: (بەندەکانی خوای میهرەبان ئەو کەسانەن، کە زۆر بە هێمنی و سەلاری بەسەر زەویدا دەڕۆن، کاتێکیش نەفامان بە قسەوقسەلۆکی ناخۆش بەرەنگاریان

---

١ ستانلي لاين – بول، *أحاديث و مناظرات النبي محمد*: ص ٣٢ (المقدمة)، هنري ماس، *الإسلام*: ص ٣٧. روبن ليفي، *سوسيولوجيا الإسلام*، المجلد الأول: ص ٧٧، رينولد نيكولسن، *تاريخ الأدب العربي*: ص ١٥٤، فليب حتي، *تاريخ العرب*، ص ١٢٣.

٢ رینولد نیکولسن، سەرچاوەی پێشوو: ص ١٢٣.

٣ هەمان سەرچاوە.

٤ رینولد نیکولسن، *تاريخ الأدب العربي*: ص ١٥٤.

٥ ستانلي لاين – بول، *أحاديث و مناظرات النبي محمد*: ص ٢٩ (المقدمة).

٦ سورەتی (الفرقان) ئایەتی ٦٣.

دەبن، لە وەلامیاندا دەڵێن: سلاو)[1]. سەرەڕای ئەو مەیلە ئاشتیخوازو نیگەتیڤانە، هاوبەشدانەرەکانی قورەیش بڕیاری کوشتنی محەمەدیان دا، بەڵام ئەو بە کاتێکی کەم پێش دەورەدانی ماڵە خاکەڕاکەی، ڕای کرد بۆ مەدینە، خۆ ئەگەر بیانکوشتایە، لەوە بوو خەڵکی وەک مەسیحی دووەم لە مێژوودا هەژماریان بکردایە.

هەر کە محەمەد گەیشتە مەدینە، گۆڕانکاری لە سروشتی ئیسلامدا ڕووی دا و ئەو ئایینە ئایدیالییە ڕووتە نەما و بە شێوەیەکی بەرچاو سەرقاڵ بوو بە کاروبارە کۆمەڵایەتییەکانەوە[2]. لەبەر ئەوە، یەکێک لە بەناوبانگترین وتەکانی پێغەمبەر بەدی دەکەین، کە دەڵێت:

**"کار بۆ دونیات بکە، وەک ئەوەی بۆ هەمیشە بژیت، کاریش بۆ پاشەڕۆژت بکە، وەک ئەوەی سبەینێ دەمریت[3]."**

زۆرینەی خۆرهەڵاتناسان لۆمەی پێغەمبەر دەکەن لەسەر ئەم وەرچەرخانەی لە ئاییندا ڕووی دا و ڕووی کردە کایەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی[4]. لەوانەیە ئەوان بە شێوەیەکی گشتی ئەوە لە ئایین داوا بکەن، کە بەدوور بێت لە هەر پیسییەکی

---

١ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٦٥. (و. ک.)

٢ ستانلي لاین – بول، سەرچاوەی پێشوو، ص ٤٣ (المقدمە). ریتولد نیکولسن، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٦٩–١٧٥. أحمد أمین، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ٣٩٢.

٣ عبدالقادر المغربي، *الأخلاق و الواجبات*، ص ٣٥.

٤ ج. شاخت، بند (محمد)، *موسوعة العلوم الإجتماعية*: ص ٥٧٠. آرنولد توینبي، *دراسة في التاریخ*، المجلد الثالث: ص ٤٦٨–٤٦٩. ریتولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ١٦٩.

دونیایی. پێمان وایە ئەوان لەم لۆمەکردنەی محەمەددا کاریگەر بووبن بە عیسا، کە ئەو تاجی پادشایەتییەی ڕەت کردەوە، کە لەلایەن خەڵکییەوە پێشکەشی کرا. بە هەرحاڵ، هەڵوێستیان لەهەمبەر پێغەمبەر لە ڕوانگەی کۆمەڵایەتییەوە ناتوانرێت بیانووی بۆ بهێنرێتەوە. هەموو بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی - جا ئایینی بێت یان نائایینی - پێویستی بەوەیە بە قۆناغی ڕێکخستنی شکڵیدا تێپەڕ ببێت، ئەمەش ناچاری دەکات بچێتە نێو کایەی کۆمەڵایەتییەوە، وەک وارنەر گێتیز دەڵێت[1].

کەواتە دەتوانین بڵێین، ناکۆکیی نێوان ئیسلام و مەسیحیەت، بە شێوەیەکی سەرەکی لەو حەقیقەتەدا خۆی دەبینێتەوە، کە بزوتنەوە ئیسلامییەکان لە سەردەمی پێغەمبەردا، بە قۆناغی ڕێکخستنی فەرمیدا گوزەریان کردووە، کە لەژێر سەرپەرشتیی خودی خۆیدا بووە. لە کاتێکدا عیسا بزووتنەوەکەی جێ هێشت، تا دوای مردنی شوێنکەوتووەکانی ڕێکی بخەن. لە ڕاستیدا محەمەد توانیی بە دەستی خۆی ئایدیالیزم و ڕیالیزم لە یەک سیستمدا کۆ بکاتەوە و وەک سیستمێکی ئامادە بۆ بەکارهێنان، رادەستی خەلیفەکانی بکات. لە کاتێکدا عیسا سەرنجی خەڵکی بۆ لای نموونە بالاکانی ڕاکێشا و تەنانەت خۆشی کردە قوربانی لە پێناویاندا، بێ ئەوەی یەکگرتنی ئەو نموونانەمان نیشان بدات لەگەڵ واقیعدا.

لێرەدا لە خاڵێکی گرنگ نزیک دەبینەوە، کە تایبەتە بە

1 کارل دوسون و وارنر غتیز، *مقدمة فی علم الإجتماع*، ص ۷۲۳ و دواتر.

گرفتی ئیسلام و پەیوەندیی بە ناکۆکیی سوننە-شیعەوە. سووربوونی عیسا لەسەر ئایدیالیزمەکەی تا کۆتاییە کارەساتبارەکەی، بووە هۆی سەرهەڵدانی دیاردەی (بەرجەستەبوون) لەنێو شوێنکەوتووەکانیدا. لەو ماوەیەی دەکەوێتە دوای مردنیەوە، بە جۆرێک بووە شتێک، زیاتر لەوەی تەنها مرۆڤێک بێت، بەڵکوو خەڵکی وەک خودا یاخود کوڕی خودا سەیریان دەکرد. پێشبینیی ئەوە نەدەکرا ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزم لە مەسیحیەتدا ئەو شێوە توندە بە خۆیەوە ببینێت، کە لە مێژووی ئیسلامدا بە خۆیەوە بینی. نموونە باڵاکانی مەسیحیەت، لە رووی سروشتیانەوە، بە خودایی هەژمار دەکران، هەر بۆیە وا دادەنرا کە مرۆڤ ناتوانێت پێیان بگات، لە کاتێکدا دەبینین ئەو کاتەی محەمەد هاتە نێو کایەی سیاسییەوە، نموونەیەکی واقیعیی بە شوێنکەوتووەکانی بەخشی، کە پێویست بوو خەلیفەکانی بە وریاییەکی زۆرەوە پەیڕەوییان بکەن. بڕوامان وایە نهێنیی گرفتی ئیسلام لێرەدایە، لەبەر ئەوە، هەر کە خەلیفەکان لە هێڵی پێغەمبەر لایان دا، نارەزاییەکی توند لەنێو موسوڵماناندا سەری هەڵدا و داوایان کرد خەلیفەکان بەتەواوی بە ژیاننامەی پێغەمبەرەوە پەیوەست بن و لێی لا نەدەن.

لە رووی کۆمەڵایەتییەوە، نموونەی واقیعی پێغەمبەر سوودێکی گەورەی هەبووە، ئاگادارکردنەوەیەکی کردەیی و بیرخستنەوەیەکی بەرجەستە بووە بۆ خەلیفەکانی دوای خۆی، تا لەژێر کاریگەریی بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیاندا لا نەدەن. دەشێ هەر ئەمەش لە هزری پرۆفیسۆر براونـدا

هەبێت، کاتێک دەڵێت:

> بەهێزیی ئیسلام، لەو ساکاری و نەرمی و نموونە ئاکارییە بالایانە دایە، کە دەکرێت لە یەک کاتدا بەدەست بهێنرێن. پێویستە دان بەوەدا بنێین، کە پێوەرە ئاکارییەکانی مەسیحیەت بالاترن، وەلێ سەبارەت بە تاکەکەس، گەیشتنپێیان دوورە و سەبارەت بە دەولەتیش، گەیشتنپێیان زۆر دوورە. دەولەتی ئیسلامی ئایدیالی، ئەگەری بەدیهاتنی هەیە، خەلیفەکانی محەمەد، ئەوانەی ڕاستەوخۆ دوای ئەو هاتن، بەکردەیی توانییان پێی بگەن[1].

فۆن وایس لە بەشی (گرفتی کڵێسا)ی کتێبەکەیدا بە ناوی *کۆمەڵناسیی مێتۆدیی*دا، ئاماژە بە سوود و زیانەکانی کۆکردنەوەی ئایدیالیزم و ڕیالیزم دەکات لە یەک سیستمدا، هەر وەک لە نموونەی ئیسلامدا هەیە و دەڵێت:

> - بەدڵنیاییەوە - ئەو یەکێتییەی لە ئەنجامی لەیەکدانی ئایدیالیزم و کۆمەڵایەتیدا دێتە دی، لەوەیە بەرەو بەهێزکردنێکی گرنگ و بەرزکردنەوەیەکی مەعنەویی تۆڕێکی دیاریکراوی پەیوەندییە ئاڵوگۆڕییەکانی نێوان مرۆڤەکان بڕوات، بەلام لەوانەشە - ئەگەر دەربڕینەکەمان دروست بێت - پرنسیپەکە زۆرێک لە کاراییەکەی لەدەست بدات، لەبەر ئەوەی ئەو بارگرانییەی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە هەڵەکانەوە دەکەوێتە

---

[1] إدوارد ج. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، ص ٨

> ئەستۆی، زۆر قورس بێت... زۆر جاریش گرفتەکە شێوەی ململانێی کارەساتباری ڕاستەقینە بە خۆیەوە دەبینێت[1].

ئێستا دەگەڕێینەوە سەر سروشتی ڕەسەنی ئیسلام و لێرەدا پرسێکی گرنگ دەخەینە ڕوو. هەر لەم بەشەدا ئاماژەمان بەوە کرد، کە ئیسلام لە ڕۆژانی سەرەتایدا لە ڕووی هەڵوێستیەوە بەرامبەر ژیانی کۆمەڵایەتی، لە مەسیحیەت دەچێت، دوای ئەوە وەرچەرخاوە بۆ سیستمێکی سیاسی-ئایینی، ئایا هۆکاری ڕاستەقینەی پشت ئەم وەرچەرخانە چییە؟

دوژمنانی ئیسلام، ئەم گۆڕانە دەگێڕنەوە بۆ خواستی کەسی پەیامبەر، ئەمەش تۆمەتێکە ئەرتۆلد تۆینبی هەوڵ دەدات لە پێغەمبەری دوور بخاتەوە و دەڵێت:

> بەردەوام تایبەتمەندیی دونیایی بووەتە هۆی خەم و پەژارە بۆ ئەو ئاوەندانەی دژی ئیسلام و پێغەمبەرەکەی بوون. بەڕوونی زۆر کەس دەبینین لە ڕوانگەی خۆیانەوە دەڵێن، ئیسلام - وەک دامەزراوە - بەدرێژاییی مێژووی خۆی، بەدەست مۆرکە دونیاییەکەیەوە ناڵاندوویەتی. هێندەی ئەوەی ئەم مۆرکە دونیاییە لەنگییەک بووە لە مێژووی ئیسلامدا، پێویستە وەک بەدبەختییەکیش لە ژیانی محەمەددا هەژمار بکرێت... بەڵام ڕەخنەگرانی دژە ئیسلام و پێغەمبەر، زۆر لەمە

---

[1] فون وایس-هاورد بیکر، *علم الاجتماع المنهجي*، ص ٦١٩ و دواتر.

دوورتر دەڕۆن، ئەوان بەو وەرچەرخانەی محەمەد لە پێغەمبەرەوە بۆ فاتیح دوای کۆچکردنی، نیگەران دەبن و وای دەبینن ئەم وەرچەرخانە ئاماژەیەکە بۆ وەرچەرخانێکی ئاکاری.

ئایا محەمەد بانگەشەی پێغەمبەرایەتیی دەکرد و هەر لە سەرەتاشەوە چاوی لەسەر پادشایەتی بووە؟ تۆماری ژیانی محەمەد لە ماوەی سیانزە ساڵدا، هەر لە یەکەمین بانگەشەکردنیەوە بۆ پەیامی پێغەمبەرایەتییەکەی لە مەککە و لە ساڵی ٦٠٩ی زایینیدا، تا دەرچوونی لە مەککە بەرەو مەدینە لە ساڵی ٦١٤ی زایینیدا، بە شێوەیەکی بنەبڕ ئەو درۆودەلەسانە یەرپەرچ دەداتەوە. بانگەشەکردنی محەمەد، شکستێکی ترسناک و ڕوون بوو لە ڕوانگەیەکی دونیاییەوە، تا ساڵی سیانزەیەمی پێغەمبەرایەتی، کاتێک لە کۆتاییدا لە مەککەوە ڕووی کردە مەدینە و لە ژیانی پێغەمبەرایەتیی ڕووتەوە بەرەو ژیانی سیاسی-ئایینی پاشەکشەی کرد. بەرئەنجامی سیانزە ساڵی سەرەتای بانگەوازەکەی، جگە لە ژمارەیەکی دیاریکراوی بڕواداران، چیی دیکە نەبوو، کە زۆربەیان ناچار بوون لە وڵات ڕابکەن و ئەویش دوژمنکاری کەللەڕەقانەی ئەو هێزانەی خستە سەر خۆی، کە لە کۆمەڵگەی دایکدا باڵادەست بوون. ئەو پێغەمبەرەی بەدرێژاییی ئەو ساڵانە لەنێو ئەو بارودۆخەدا بەردەوام بوو لەسەر گەیاندنی پەیامەکەی، بەدڵنیاییەوە ئەوەی پاڵی پێوە دەنا، تەنها بڕوایەکی ئایینی قووڵ و ڕەسەن بوو، هەر دەبێت بڕواشی بەوە هەبووبێت، کە قوربانی بە ئاسۆ دونیاییەکانی

دەدات، ئەو هەرگیز خاوەن وەهم نەبووە، بەڵکوو لەسەر ڕێگەی دروستکردنی شانشینە دونیاییەکەی بووە.

کەواتە پێویستە محەمەد لەو تۆمەتە پاک بکەینەوە، کە ئەو کاتەی پەیامی پێغەمبەرایەتییەکەی لە مەککە بڵاو دەکردەوە، نەخشەگەلێکی سیاسیی دەشاردەوە، بەڵام هەر پێویستە چۆنێتیی وەرچەرخانی بۆ ژیانی سیاسی ڕوون بکەینەوە، کە دواتر تیایدا سەرکەوتوو بوو، سەرکەوتنێکی مەزن.

دەشێ ڕاڤەی ئەمە لە سروشتی ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەدا بدۆزینەوە، کە محەمەدی تێدا لەدایک بووە، ئەگەر بپرسین: "بۆچی محەمەد ئەوەی هیی قەیسەر بووە، نەیداوە بە قەیسەر؟" وەڵامی ڕوون ئەوەیە، - محەمەد بەپێچەوانەی عیساوە - هەرگیز لەژێر فەرمانڕەوایی قەیسەردا نەژیاوە، لە کاتێکدا عیسا یەکێک بووە لە شوێنکەوتووانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی، لەبەر ئەوە، لەژێر ڕەحمەتی حکومەتی ڕۆمانیدا بووە. – لە لایەکی دیکەشەوە - محەمەد پاشکۆی هیچ دەوڵەتێک نەبووە، ماڵەکەشی لە دەرەوەی سنووری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا بووە و دوور بووە لە قەیسەرەوە. جیاوازیی گەورەی نێوان ئەم دوو ژینگەیە – بە لایەنی کەمەوە بەشێک - لەو ناکۆکییە توندەی نێوان چێژی دونیاییی ئەم دوو پێغەمبەرە ڕاڤە دەکات، کە هەریەکەیان وا خۆیان بە تاکەکانی کۆمەڵگەکەی خۆیان ناساندووە، کە نێردراوی خودان و پەیامێکی نامۆیان هێناوە، کە تەواوی بیروباوەڕ و مومارەسەکانی پێشوویان هەڵدەوەشێنێتەوە.

بەسادەیی خەڵکیان بانگ کردووە بۆ ئەوەی ئەوان فەرمانڕەوای ڕەهای ئەوانن و فەرمانی خۆیانیان بەسەردا ناسەپێنن، بەڵکوو ئەوەی دەیسەپێنن، فەرمانی خودایە[1].

بە بۆچوونی ئێمە، تۆینبی لە گێڕانەوەی سروشتی ئیسلام – بە لایەنی کەمەوە، کەمەکێک – بۆ ئەو ژینگە کۆمەڵایەتییەی محەمەد تیایدا ژیاوە، لەسەر حەق بووە، بەڵام ئەو خاڵەی پێویستە لێرەدا باسی لێوە بکەین، ئەوەیە تۆینبی لەنێو تایبەتمەندییەکانی ژینگەی کۆمەڵایەتیدا، تەنها جەخت لە تایبەتمەندیی سیاسی دەکاتەوە، ئەمەش وەک پێویست نییە. بڕوامان وایە، هەر دەبێت چەند تایبەتمەندییەکی دیاریکراوی دیکەش هەبن، کە وا دەکەن محەمەد لە عیسا جیاواز بێت، پاشانیش وا دەکەن ئیسلام جیاواز بێت لە مەسیحیەت.

ئەو تەرزە کولتوورییانەی لە سەردەمی محەمەددا لە دوورگەی عەرەبیدا باو بوون، زۆر جیاواز بوون لە تایبەتمەندییەکانی فەلەستینی سەردەمی مەسیح، زۆرینەی عەرەب سارانشین بوون، لە کاتێکدا گاورەکان بە شێوەیەکی سەرەکی پیشەوەر و جووتیار بوون. دەکری ئەمە کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر ڕاڤەکردنی جیاوازیی نێوان مەسیحیەت و ئیسلامدا هەبێت، وەک دواتریش دەیبینین.

هەریەک لە ماکس ڤێبەر و ترویلتش، پێیان وایە ژینگەی کۆمەڵایەتیی هەر دەستەیەکی ئایینی، ڕۆڵێکی گرنگ لە دیاریکردنی سیماکانی بیروباوەڕیاندا دەگێڕێت[2]. کەواتە

[1] آرنولد توینبي، *دراسة في التأريخ*، المجلد الثالث: ص ٤٦٨-٤٦٩.

[2] لە کتێبی (هـ ریتشارد نیبور، *الأصول الإجتماعية للطائفية*: ص ١٧)ەوە وەرگیراوە.

پێویستە لەو فاکتەرانە بکۆڵینەوە، کە کار دەکەنە سەر سروشتی ئیسلام و سروشتی ئەو سارانشینانەی ئیسلام لەنێویاندا دەر کەوتووە، کەواتە تایبەتمەندییەکانی عەرەبی سارانشین کامانەن؟

بەشێکی زۆری ئەوانەی لە کولتووری سارانشینییان کۆڵیوەتەوە، لەسەر ئەوە کۆکن کە ئایین لای سارانشینەکان، پێگەیەکی لاوازی لە دڵیاندا هەیە[1]. گەڕیدەی عەرەبی بەناوبانگ، ئەمین ڕەیحانی، دەڵێت: "سارانشینەکان تا ئەمڕۆکە، جگە لە زمانیان، قەرزاری هیچی دیکەی پێغەمبەر نین[2]."

قورئانیش لەبارەیانەوە دەڵێت:
(ٱلْأَعْرَابُ أَشَدُّ كُفْرًا وَنِفَاقًا وَأَجْدَرُ أَلَّا يَعْلَمُوا۟ حُدُودَ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ)[3] واتا: (زۆربەی عەرەبە کۆچەری و دێهاتی و بیابانشینەکان "لە عەرەبە شارنشینەکان" دڵڕەقترن لەبارەی کوفر و دووڕوویییەوە، شایستەترن ئەو سنوورانە نەزانن، کە خوا ناردوویەتیە خوارەوە بۆ پێغەمبەرەکەی، خوای گەورەش زانا و دانایە)[4].

هیچکەس هەوڵی نەداوە ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتییە ڕاڤە

---

١ فیلیب حتي، *تاریخ العرب*: ص ٣٦. رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ١٣٥-١٧٥. ي. براون، *تاریخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٧٨. أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ٨٢-٨٣. ت. هـ وایر، بند (الجاهلیة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢٣٣.

٢ أمین الریحاني، *تاریخ نجد*: ص ٩٧.

٣ سورة التوبة، الآیة: ٩٧.

٤ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٢٠٢. (و-ک.)

بکات، کە لەپشت ئەم دیاردە ئامۆیەوە وەستاوە. ئێمە پێمان وایە ئایین، لە کۆمەڵگەی دوورگەی عەرەبیدا، وەزیفەیەکی گرنگی نییە، لەوانەیە سارانشینەکان ڕانەهاتبن وەک خەڵکی دیکە بە ئایینەوە پەیوەست ببن.

ڕاینهۆلد نیبۆر دەڵێت، ئایینی قووڵ ئەو هەوڵ و کۆششەیە، کە بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هەڕەشەکانی ڕەشبینی دەدرێن[1]، یاخود وەک ئێتچە بە شێوەیەکی پەرگیرانە بە (شۆڕشی کۆیلەکان) ناوزەدی دەکات[2]. بە شێوەیەکی سەرەکی، بەلای ئەو چینانەی خەڵکییەوە پەسەندە، کە بێبەش و چەوسێنراوەن، یاخود ئیستیغلال کراون.

کەواتە لە کۆمەڵگەی سارانشینیدا، جێگەیەک نییە بۆ ئایین، چونکە زۆر بەسادەیی چینی ستەملێکراویان لەنێودا نییە. پۆلێنی چینایەتی لەنێو سارانشیناندا، پۆلێنکردنێکی ستوونییە نەک ئاسۆیی، ڕێکخستنی خێڵەکی، کە بە شێوەیەکی سەرەکی لەسەر پەیوەندیی خزمایەتی دامەزراوە، بنچینەی کۆمەڵگەی خێڵەکییە[3]. کەمەکێک نەبێت، سیستمی چینایەتیی ئاسۆیی بەدی ناکرێت، کە زۆر جار لە کۆمەڵگە کشتوکاڵییەکاندا بەدی دەکرێت وەک نموونە، کە لە چینی دەوڵەمەند و هەژار، یان چینی ستەملێکراو و ستەمکار پێک

١ ڕاینهۆلد نیبور، *المسيحية و سياسات السلطة*: ص ١٧٩.

٢ پێدەچێت ڕێککەوتنێک لەنێوان لێکۆڵەرەوانی ئایینیدا نەبێت دەربارەی ئەو پێناسەیەی تەواوی دیاردە ئایینییەکان لەخۆ دەگرێت. ئێمە لێرەدا ئەم دوو پێناسە لەیەکچووەمان هەڵبژاردووە، چونکە تایبەتمەندیی جەوهەریی ئایینمان پێ دەبەخشن، بە لایەنی کەمەوە، لەسەر شێوازی ئایینی مەسیحی، کە ئێمە لێرەدا لە شێوازەکانی دیکە بەلامانەوە گرنگترە.

٣ فیلیپ حتي، *تاريخ العرب*: ص ٢٦.

دێت، وەک ئێل. بی. ئێدواردز دەڵێت. سارانشینی لە ڕوانگەی بیبەر لامینزەوە، دیموکراسیەتی نموونەییە[1]. فیلیپ هیتی، مامۆستای ئەدەبی سامی لە زانکۆی برنستن، بڕوای وایە کە:

> عەرەب بە شێوەیەکی گشتی و سارانشین بە شێوەیەکی تایبەتی، بە دیموکراسی لەدایک دەبێت، ئەو و سەرۆکی خێڵەکەی هاوڵاتین. لەو کۆمەڵگەیەدا کە سارانشینی تێدا دەژی، هەموو شتێک یەکسانە[2].

دەکرێ ئەمە ئەو هۆکارە ڕاڤە بکات، کە وای لە محەمەد کرد "پشت بە سارانشینان نەبەستێت و داوای سەرخستنی لە خەڵکی مەدینە بکات[3]." خەڵکی مەدینە و گوندنشینەکان، چینگەلی لاوازیان لەنێودان، کە لەلایەن چینە دەوڵەمەندەکانەوە ئیستیغلال دەکرێن و سووک دەکرێن، لەبەر ئەوە، ئەو ڕێسا کۆمەڵایەتی و دیموکراسییانەی پێغەمبەر هێنانی لەسەر یەکسانی، بەلای خۆیدا بەکێشی کردن. وەلی سارانشینەکان پێچەوانەی ئەمە بوون، بە هۆی جەنگە خێڵەکییە بەردەوامەکانیانەوە نەیانتوانیوە تاکگەلێکی گوێڕایەڵ پەروەردە بکەن، کە ئیستیغلالکردن و سوکایەتیپێکردن قبوڵ بکەن. وەک مویەر باسی لێوە دەکات: "بەکورتی، شەرەف و تۆڵە، بەهای سەرەکیی عەرەبی

---

١ (أحمد أمین، لە فجر الإسلام: ص ٣٣)دا وەریگرتووە.
٢ فیلیب حتي، تاریخ العرب: ص ٢٨.
٣ هنري ماس، الإسلام: ص ٢٧.

جاهیلی بوون...[1]"

ئۆلیری بڕوای وایە، عەرەبەکان تەنانەت ڕقیان لەو کەسانەش دەبێتەوە، کە چاکەیان لەگەڵدا دەکەن، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە پێشکەشکردنی چاکە، واتە بەدەستهێنانی جۆرێک لە گەورەیی بەسەریاندا[2]. جێی سەرسامی نییە کە ئەو پێغەمبەرەیان خۆش نەوێت، کە فێری کردن، وەک لە قورئاندا هاتووە:

(الَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي السَّرَّاءِ وَالضَّرَّاءِ وَالْكَاظِمِينَ الْغَيْظَ وَالْعَافِينَ عَنِ النَّاسِ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)[3] واتا: (ئەوانەی لە خۆشی و ناخۆشیدا، لە هەرزانی و گرانیدا، ماڵ و سامانیان دەبەخشن و ڕق و کینەی خۆیان دەخۆنەوە و خۆگرن و لە خەڵکی خۆش دەبن و لێیووردەن، خوای میهرەبانیش چاکەکار و چاکەخوازانی خۆش دەوێت)[4].

ئەگەر تیۆری داروینزم (ململانێ لەپێناو مانەوەدا و مانەوەش بۆ باشترینە) بە شێوەیەکی گشتی نەتوانرێت بەسەر کۆمەڵگەی مرۆییدا پراکتیزە بکرێت، بەڵگەیەکی شیاو هەیە – بە لایەنی کەمەوە – پشتگیریی لە پراکتیزەکردنی تیۆرەکە دەکات لەسەر کۆمەڵگەی سارانشینی. جەمالی دەڵێت:

بڕی خۆراک لە بیاباندا زۆر کەمە،

---

١ ي. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٣٩.

٢ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ٣٥. کە لە (أوليري، *الجزيرة العربية قبل الإسلام*)ەوە وەریگرتووە.

٣ سورة آل عمران، الآية: ١٣٤.

٤ بورهان محمد امين، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٦٧ (و. ک.)

سەرچاوەکانی بەرهەمهێنانیش کەموکورتن، لە ئەنجامدا سارانشینانی بیابان پەنایان بردووەتە بەر پەلاماردان، وەک ئامرازێک بۆ ژیان، پەلاماردان خوویەکە، خێڵەکانی بیابان دانیان پێدا ناوە، هەرشتێک لە ڕێی پەلاماردانەوە بەدەست بهێنرێت، دەبێتە موڵکی ڕەوای کەسی پەلاماردەر، بەڵام تا کەی دەتوانێ خاوەندارێتیی ئەو تاڵانییە بکات، ئەمە پشت بە هێز و چاوکراوەیی خێڵەکەی دەبەستێت. لەبەر ئەوە، خاوەندارێتی لە بیاباندا زۆر درێژە ناکێشێت، دەگمەن نییە لە شەو و ڕۆژێکدا کەسێکی دەوڵەمەند هەژار بکەوێت، یاخود هەژارێک دەوڵەمەند ببێت، بە هۆی پەلاماردانەوە. بەدڵنیاییەوە پەلاماردان ڕێگەیەکی ناکامە لە ململانێی لەپێناو مانەوەدا، سەرەڕای ئەوەی دەشێ لە ئەنجامی لەناوبردنی ناباش و مانەوەی باشترینەوە بێتە دی. لەناوبردن لایەنە بایەخدارەکەیە، چونکە پارێزگاری لە دوورگەی عەرەبی دەکات لەوەی تووشی هەڵاوسانی دانیشتووان بێت و تەنها ڕێگەش بە مانەوەی ئەو ژمارەیە لە دانیشتووان دەدات، کە دەتوانن بەو برە خۆراکە کەمەی هەیە، بژین[1].

وەک خۆرهەڵاتناسی هەنگاری، دکتۆر گۆڵدتسیهەر ڕوونی دەکاتەوە، ململانێیەکی توند لەنێوان تەرزی کولتووریی

---

١ محمد فاضل الجمالي، *العراق الجديد*، ص ٢٩-٣٠.

سارانشینی و ڕۆحی ئیسلامدا هەیە[1]. سارانشینەکان تێڕوانینێکی سوودگەرای مادییان هەیە بۆ ژیان، ئەحمەد ئەمین لەبارەی سارانشینەوە دەڵێت:

> خەیاڵی سنووردارە و قورسە بەلایەوە ژیانێکی دیکەی باشتر لەو ژیانە وێنا بکات، کە هەیەتی، لەبەر ئەوە، بە نموونە باڵاکان ئاشنا نەبووە، چونکە لە خەیاڵەوە سەرچاوەی گرتووە، لە زەمانەکەشیدا تاکە وشەیەکی بۆ دانەناوە، کە دەلالەتی لێ بکات[2].

محەمەد لەنێو ئەو بارودۆخەی دەوری دابوو، ناچار بوو ڕێگەیەکی دیکە بدۆزێتەوە تا سارانشینەکان بۆ ئایینەکەی ڕابکێشێت، جیاواز لەو ئایدیالییەی خۆی لە ژیانێکی کۆمەلایەتیی باڵاتر و پڕخۆشەویستیتر و برایەتیتر دا دەبینێتەوە. پێویست بوو شتێکیان نیشان بدات، تێی بگەن. ساڵانێکی دووردرێژی لە بانگکردنیان بۆ نموونە باڵاکانی گوزەراند، بەلام ئەمە کاری تێ نەکردن. لەوانەیە بەلگەیەکی بەرجەستەتریان ویستبێت لەسەر پەیامە پێغەمبەرایەتییەکەی، کە لەگەڵ بەها سوودگەرا-مادییەکەیاندا بگونجێت.

ئەو شتەی زیاتر لە هەرشتێکی دیکە لە بیاباندا جێگەی سەرسامی و ڕێزە، کە تیایدا ململانێیەکی توند لەپێناو مانەوەدا هەیە، بەدڵنیاییەوە هێزی سەربازی و سەرکەوتنە.

---

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ١٧٧-١٧٨. أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ٧٦ و دواتر. ي. براون، *تاریخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٩٠.

٢ أحمد أمین، سەرچاوەی پێشوو: ص ٣٧.

پێغەمبەرێکی بێهێز، چارەنووسی شکستە لە بیابانی دوورگەی عەرەبیدا. ئیبن خەلدوون کە پسپۆرە لە کاروباری سارانشینیدا، هەر ئەو مەبەستەی هەیە، کاتێک دەڵێت: "بانگەوازی ئایینی بێدەمارگیریی، سەرکەوتوو نابێت[1]."

لێرەدا بایەخی گەورەی جەنگی بەدر لە مێژووی ئیسلامدا دەر دەکەوێت، کە تیایدا محەمەد سەرکەوتنێکی گەورەی بەسەر هێزێکی گەورەدا بەدەست هێنا، کە لە ساڵی یەکەمی دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە، لە مەککەوە کشابوون بۆی، وەک نیکولسن دەڵێت، جەنگی بەدر یەکێکە لە مەزنترین ئەو جەنگانەی لە مێژوودا لەبیر ناکرێن. "لە کۆتاییدا ئەو پەرجووە هاتە دی، کە دوژمنانی محەمەد لێیان دەخواست[2]."
لەکۆتاییدا سارانشینەکان درکیان بەوە کرد، کە بەڕاستی محەمەد پێغەمبەرە و لەلایەن خوداوە نێردراوە، خودا لە بەدردا لەگەڵیدا شەڕی کرد، هەربۆیە لە جەنگەکەدا سەر کەوت، ئەگەر وا نەبووایە، شکستی دەهێنا.

سەرەڕای ئەوەی سارانشینەکان بەکۆمەڵ باوەشیان بە ئیسلامدا کرد، بەڵام زۆرینەیان بڕوایان پێی نەبوو و پێشی ئاشنا نەبوون، وەک پرۆفیسۆر نیکۆلسن دەڵێت:

> زۆرینەیان پاڵنەرەکەیان سوودگەرایی بوو، بە شێوەیەکی ڕاشکاوانەش بڕوایان وا بوو ئیسلام بەختیان بۆ دێنێت... بە جۆرێک، ئەو پیاوانە دەیانتوانی هەڵچوونی ئایینی خۆیان دەر بخەن،

---

١ إبن خلدون، *المقدمة*: ص ١٥٩ و دواتر.
٢ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ١٧٤.

ئەو سەرکەوتنانەی بە ماوەیەکی کەم دوای ئەوە
بەدەستیان هێنان بەسەر سوپای ڕێکخراوی دوو
ئیمپراتۆریەتی مەزندا، ئەمە دەسەلمێنن. وەلێ
ئەوەی بە شێوەیەکی سەرەکی هاندەریان بوو –
بە چاوپۆشین لە خۆشەویستیی تالانی - بڕوایان
وا بوو، کە لەو سەرکەوتنانەیانەوە سەرچاوەی
گرتبوو، کە بەدەستیان هێنابوون، بەوەی کە خودا
لەگەڵیاندا دەجەنگێت[1].

شاخت پێی وایە، ئەم وەرچەرخانە لە سروشتی ئیسلامدا بووە هۆی ئەوەی چەند قات ڕۆحی ئایینی لە کۆمەڵگەدا زیاد بکات، لەسەر ئەو بنەمایەی ئەوانەی باوەشیان بۆ ئیسلام کردەوە، ئەمەیان بۆ مەبەستێکی دونیایی کرد، نەک مەبەستێکی ئایینی[2].

پێدەچێت شاخت بێئاگا بێت لەو ڕاستییە مێژوویییە-کۆمەڵایەتییەی هیچ ئایینێک ناتوانێت بۆ هەتاهەتایە خاڵی بێت لە پیسکەرە دونیاییەکان. پرۆفیسۆر گاوین دەڵێت، مەسیحیەتیش هەر لە سەردەمی کۆستانتینی گەورەوە، تێکەڵ بە سیاسەت و بەرژەوەندیی دونیایی بووە:

دوای جەنگی پردی میلیڤان، کۆستانتین
سوێندی خوارد، کە ماوەیەکی کەم پێش
شەڕەکە خەونێکی بینیوە، لە خەویدا خاچێکی
بینیوە لەژێریدا نووسراوە "بەم نیشانەیە سەر

١ ڕینولد نیکولسن، *تاريخ الأدب العربي*، ص ١٧٩.
٢ ج. شاخت، بند (محمد)، *موسوعة العلوم الاجتماعية*، ص ٥٧٠.

دەکەویت." سەرکەوتنیشی لەو جەنگەدا ئەو بروایەی لا پتەوتر کرد، کە لە ڕێی ئایینی مەسیحییەوە نەبێت، ناتوانێت ئیمپراتۆریەتەکەی یەک بخات. ئەم کارەش دە ساڵی خایاند تا توانیی خۆی بکاتە تاکە ئیمپراتۆر، بەڵام کاتێک ساڵی ٣٢٣ی زایینی ئەمەی هێنایە دی، ڕاستەوخۆ کەوتە جێبەجێکردنی پلانەکەی، تا ئایینی مەسیحی بکاتە ئایینی فەرمی...

بۆ بەدبەختی، چیرۆکەکە دیوێکی دیکەشی هەیە. ئیمپراتۆریەتەکە لەگەڵ ئەو هێزە دونیاییەشیدا کە هەیبوو، نەتوانرا بگۆڕدرێت بۆ نەسرانی، هەر دەبوو بەمە، وەک عەرشی مەسیحی دەجال بمێنێتەوە. ڕاستە ڕێگریی لە دەسەڵاتی ئەباتیرە لەخۆباییەکان کرد و چاودێریی ئیمپراتۆریەتەکەشی دەستەبەر کرد، بەڵام هەموو ئەمانە باجی خۆیان ویست. ئەگەر لە ڕابردوودا ترسێک هەبووبێت لە بەهێزیی شێر، بەڵام هەڕەشەکردنی مار لە ترسی شێرەکە کەم ناکاتەوە. ئەگەر مەسیحییەکان، ئەوانەی قوربانییان پێشکەش بە بتەکان دەکرد، یاخود بخوردیان بۆ دەسووتاندن، یاخود بە هۆی لاوازییانەوە لە پرسی مەسیحیدا بوختانیان هەڵبەستبێت، ئەوا مەترسییەکی سەد هێندە گەورەتر لەئارادا بوو، ئەویش ئەو دەستوپێوەندە مەراییکارانە بوون، کە

تا دوێنێ خەڵکیان دەچەوساندەوە، کەچی ئەمڕۆ بیبوونە چاودێری ئایین. گەشەکردنی ڕووتی دونیایی، بووە هۆی زیادبوونی ڕیاکاری، ئاگری کەسێک تەنها بە ناو مەسیحی بێت و حەزی لە شەهیدبوون نەبێت... چیرۆکی کۆستانتین، هیچ بنەمایەکی مێژوویی نییە، بەڵام وشەکانی دانتی ئەلیگیێریش خاڵی نین لە ڕاستییەکی خەماوی:

ئای کۆستانتین، چ خراپە و بەدکارییەکت لێ کەوتەوە
بە دانیێدانانی خۆت نا، بەڵکوو بەو بەخششە دڵفراوانییەی
یەکەمین پاپای زەنگین لێی وەر گرت

ئاشکرایە شاری خودا بە شێوەیەکی تەواوەتی لەسەر زەوی بوونیاد نەنرا - لە سەدەی چوارەمیدا، مەزنتر نەبوو لە سەدەی یەکەمی - ناشتوانرێت ئەو ئیمپراتۆریەتەی وەرچەرخا بۆ نەسرانی، بەوە وەسف بکرێت کە لەگەڵ کلێسادا گونجاوە، کە خاڵی بووە لە مرۆڤایەتی. وانەی سەرەکی ئەو ماوەیە، ئەوەیە کە پێویستە بەردەوام بین لەسەر ئەوەی سەرنجی خەڵکی بۆ داهاتوو ڕابکێشن. ڕاستە دڕندەکە و پێغەمبەرە درۆزنەکەش سەر بڕدران، بەڵام خەڵکی بەگشتی سێیەرەکەی خۆیانیان دەپەرست. هەر دەبێت شەڕکردن بەردەوام بێت، پێویستیشە مەسیحییەکان فێری ئەوە بین، کە شوێنێکیان لە جیهانی داهاتوودا هەبێت. هەندێک لە ئەرکە قورسەکە ڕایان کرد و

پەنایان بۆ شاری نقومبووی بیابان برد، هەندێکی دیکەش زۆر بەسانایی لەهەمبەر باقوبریقی ژیانی دونیاییدا خۆیان دا بەدەستەوە، وەلێ ئەو تاوانبارانەی لە هەوڵ و کۆشش نەوەستان، بوونە شەهیدی بیروباوەڕەکەیان، وەک شەهیدانی ئەوەکانی سەرەتا، کە لەنێویاندا هەندێک قەشەی کلیسای مەزن هەبوون، ئەوانەی شەهیدبوونیان بەفیڕۆ ڕۆیشت[1].

ئەوەی دەمانەوێت لەم وەرگرتنە درێژە هەڵی بهێنجین، ئەوەیە هەمان شت بەسەر ئیسلامیشدا پراکتیزە دەبێت، بەڵام لە سەدەی یەکەمی مێژووەکەیدا، نەک لە سەدەی چوارەمیدا!!

١ هیربرت هـ غاوین، *تاریخ الدین*، ص ٤٩٠.

لە بەشی پێشوودا ئەوەمان ڕوونکردەوە، دوو جۆر لەو خەڵکە هەن، کە ئیسلام لە سەردەمی پێغەمبەردا بەلای خۆیدا کێشی کردوون:

١. خەڵکێکی تێکشکاو، ئەوانەی لە ئیسلامدا هەتوانێکیان دەبینی بۆ هەستە بریندارەکانیان.

٢. سارانشینەکان، ئەوانەی لە ئیسلامدا هەلێکی گەورەیان بەدی دەکرد بۆ بەهێزکردنی بەرژەوەندییە دونیاییەکانیان و باڵادەستبوونیان بەسەر خەڵکی دیکەدا.

وەک ئەحمەد ئەمین ئاماژەی پێ دەکات، ململانێیەکی توند لەنێوان ئەم دوو دەستەیەدا سەری هەڵدا و بۆ ماوەیەکی دوورودرێژیش بەردەوام بوو[1].

عەلایلی پێمان ڕادەگەیەنێت، کە ڕاستەوخۆ دوای مردنی پێغەمبەر، بەشێک لە یاوەران ژیانی سیاسییان جێ هێشت و ڕوویان کردە بەجێهێنانی ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیان بە شێوەیەکی نهێنی. وایان دەبینی نابێت ئیسلام بچێتە نێو سیاسەت و کاروبارە دونیاییەکانەوە[2].

بڕوامان وایە ئەم چیرۆکە دەلالەت و بایەخێکی گەورەی

١. أحمد أمين، *فجر الإسلام*، ص ٨٢.
٢. عبدالله العلايلي، *تأريخ الحسين*، ص ٨١.

هەیە، سەرەرای ئەو بایەخەی مێژوونووسانی ئیسلام پێیان داوە. ئەم هەڵوێستە بەڕوونی، بێگەردیی ویژدانی ئایینی مسولمانە یەکەمینەکانمان نیشان دەدات، هەروەها ئاماژەش بە سروشتی سەرەتای ئیسلام دەکات، کاتێک ئایینێکی بێگەرد بووە و تەنها بایەخی بە گیانی مرۆیی داوە و دڵسۆزیی تێدا چاندووە. لە راستیدا زۆرێک لە مسولمانان بڕوایان وایە پێغەمبەر مەبەستی نەبووە ئەو ئایینەی هێناویەتی لە کۆتاییدا بگۆڕێت بۆ سیستمێکی سیاسی. ئەوان دەڵێن، تاکە مەبەستی پێغەمبەر لە جەنگ لە مەدینەدا، پارێزگاریکردن بووە لە شوێنکەوتووەکانی دژی تۆقاندن و چەوساندنەوە. پێدەچێت قورئانیش پاڵپشتیی ئەم بۆچوونە بکات. مسولمانان فەرمانیان پێ کرا بۆ شەڕکردن، نەک بۆ بونیادنانی دەوڵەت، بەڵکوو بۆ دەستەبەرکردنی شوێنێکی پارێزراو بۆ مسولمانان، تا بەئازادانە ڕێوڕەسمە ئایینییەکانیان بەجێ بهێنن.

(أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَٰتَلُونَ بِأَنَّهُمۡ ظُلِمُواْۚ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصۡرِهِمۡ لَقَدِيرٌ ٣٩ ٱلَّذِينَ أُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِم بِغَيۡرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُۗ وَلَوۡلَا دَفۡعُ ٱللَّهِ ٱلنَّاسَ بَعۡضَهُم بِبَعۡضٖ لَّهُدِّمَتۡ صَوَٰمِعُ وَبِيَعٞ وَصَلَوَٰتٞ وَمَسَٰجِدُ يُذۡكَرُ فِيهَا ٱسۡمُ ٱللَّهِ كَثِيرٗاۗ وَلَيَنصُرَنَّ ٱللَّهُ مَن يَنصُرُهُۥٓۚ إِنَّ ٱللَّهَ لَقَوِيٌّ عَزِيزٌ)[1] واتا: (مۆڵەت دراوە بەو ئیماندارانەی شەڕیان پێ دەگێڕن، کە بجەنگن و بەرهەڵستی بکەن، چونکە بەراستی ستەملێکراون، بێگومان خودا دەسەڵاتی هەیە کە سەریان بخات و سەرکەوتنیان پێ ببەخشێت ٣٩ ئەوانەی بە ناحەق لە وڵاتیان دەربەدەر کران، "تەنها تاوانیان ئەوە

[1] سورة الحج، الآيتان ٣٩-٤٠.

بووە" کە دەیانوت: پەروەردگارمان "الله"یە، خۆ ئەگەر خودا خەلکی نەدا بەیەکدا و حەق دژی بەتاڵ نەوەستێت، هەرچی شوێنی خواپەرستیی جوولەکە و گاور هەیە لە خەڵوەتگە و کڵیسا، هەروەها مزگەوتەکانیش کە ناوی خوای زۆرتر تێدا دەبرێت، هەمووی کاول دەکرێت، سوێند بێت بێگومان خودا ئەو کەسە سەر دەخات، کە پشتگیری ئایین و بەرنامەکەی دەکات و هەوڵی سەرخستنی دەدات، بەڕاستی خودا زۆر بەهێز و باڵادەستە)[1].

لە شوێنێکی دیکەشدا دەڵێت:

(وَقَاتِلُوهُمْ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتْنَةٌ وَيَكُونَ الدِّينُ لِلَّهِ)[2] واتا: (ئێوەش دژیان بجەنگن، تاکوو هاوەڵگەری و ئاشووب و ناخۆشی نەمێنێت، هەروەها تا ئایین و بەرنامە و فەرمانڕەوایی هەر بۆ خودای گەورە بێت...)[3].

بەڕای ئێمە، هەڵەیە ئەگەر وەک پیاوی دەوڵەت، واتا کەسێک کە نیازێکی ئاشکرای دامەزراندنی دەوڵەتی هەیە، ئاماژە بە پێغەمبەر محەمەد بکەین. ئەگەر بەوردی سەرنج لە مێژووی محەمەد بدەین دوای کۆچکردنی بۆ مەدینە، دەبینین ئەوەی هزری ئەوی سەرقاڵ کردووە، هەرگیز سیاسەت نەبووە، بەڵکوو نیازی سەرەکیی، بێچەندوچوون، ڕێکخستنی شوێنکەوتووەکانی بووە لە سوپایەکی ڕێکخراودا،

---

١ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٣٧. (و. ک.)

٢ سورة البقرة، الآية: ١٩٣.

٣ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٣٠. (و. ک.)

تا پارێزگاری لە ئایینەکەی بکەن. بڕوامان وایە کینکلوی ڕاست دەکات کاتێک وەک "سەرکردەیەکی سەربازی، سەرباری ئەوەی پێغەمبەریشە[1]" ئاماژ بە محەمەد دەکات. هێزی بوونیادنانی دەوڵەت، دەشێ لەدوای چاودێریکردنی سیاسەتی جەنگ لەسەر ئاراستە سروشتییەکەیەوە پەرەی سەندبێت.

خودا ڕێگەی بە مسوڵمانان دا شەڕ بکەن، وەک قورئان گوزارشتی لێ دەکات، چونکە ستەملێکراو بوون. بەڵام کاتێک جەنگ هەڵدەگیرسێت، ئامانجە ڕاستەقینەکەی لەدەست دەدات، بەتایبەت دوای مردنی پێغەمبەر.

سارانشینەکان لەسەر شەڕ و کوشتار ڕاهاتبوون، تەنانەت ئەگەر کەسێکیان دەست نەکەوتایە شەڕی لەگەڵدا بکەن، لەنێو خۆیاندا بەشەڕ دەهاتن. یەکێک لە شاعیرانی عەرەب[2]، ئەم خووە ڕەگداکوتاوەمان لە ڕێی ئەم دێرەشیعرانەوە بۆ وەسف دەکات و دەڵێت:

مـن تكـن الحضـارة أعْجَبتـه — فَـأي رجـال بـاديــة تَـرَانَا
وَمن ربط الجحاش فَإن فِينَا — قِنًا سلبا و أفراسا حسـانا
وَكن إذا أغـرن عـلـى جنـاب — وأعوزهن نهب حَيْثُ كَانَا
أغرن من الضباب على حُلُول — وضبة إنَّه من حَـان حـانا[3]

---

١ صامويل كلارنس كينكلوي، *النبي محمد: دراسة في سوسيولوجيا القيادة*: ص ٩.

٢ ناوی شاعیرەکە (القطامي التغلبي)یە. (و. ک.)

٣ فليب حتي، *تاريخ العرب*، ص ٢٥. أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ٩.

(واحیاناً علی بکرٍ اخینا          إذا ما لم نجد إلا آخانا)[1]

لێکدانەوەی شیعرەکە:

کەسێک کە بە شارستانیەت سەرسام بێت، ئەبێ بە چ چاوێک سەیری ئێمەی سارانشین بکات، لە کاتێکدا ئێمە لەوان لەپێشترین. ئەگەر ئەوان بە بەستنەوەی جاشولکەیەک رازی بین، ئەوا ئێمە خاوەن شمشێری درێژ و ماینی جوانین بۆ هێرشکردنە سەر دوژمنانمان. هەرکات هێرش بکەینە سەر شوێنێک، ئەوا بەتەواوەتی تالانی دەکەین. هێندە لەسەر هێرشکردن و پەلاماردان راهاتووین، ئارام ناگرین تا کاتی دێت و لە ناوەختیشدابێت هەر هێرش دەبەین. خۆ ئەگەر کەسمان دەست نەکەوت پەلاماری بدەین، ئەوا پەلاماری برا و ئامۆزاکانمان دەدەین.

کەواتە هەر دەبوو خەلیفەکان مەیلە شەڕەنگێزییەکانی سارانشینەکان بەرەو جیهانی دەرەوە ئاراستە بکەن، لەپێناو پارێزگاریکردن لە ئاسایش و سیستمی نێوخۆیی، ئەنجامەکەش، بوونیادنانی ئیمپراتۆریەتێکی مەزن بوو، فیلیپ حەتی دەڵێت:

هەڵمەتە سەربازییەکان، بە مانای وشە، بەرئەنجامی حیسابگەلێکی دواخراو و لەسەرخۆ نەبوون، بەڵکوو پێدەچێت وەک داگیرکارییەک دەستیان پێ کردبێت بۆ پەیداکردنی ڕکابەری

---

١ ئەم دێرە لە دەقە عەرەبییەکەدا نییە، بەڵام پێمان وابوو بەم دێرە مانای شیعرەکە تەواوتر دەبێت، بۆیە دامان ناوەتەوە. (و. ک.)

نوێ بۆ گیانی شەڕەنگێزی ئەو خێڵانەی ئێستا قەدەغەبوو لەنێو خۆیاندا شەڕ بکەن. لە زۆرینەی حاڵەتەکانیشدا ئامانج لێیان، دەستخستنی تاڵانی بووە نەک شوێنپێیەکی هەمیشەیی، بەڵام ئەو ئالیەتەی لەسەر ئەم بنەمایە بوونیاد نرا، لەدەست بوونیادنەرانی دەر چوو، هەر کە جەنگاوەرەکان لە سەرکەوتنێکەوە بەرەو سەرکەوتنێکی دیکە دەڕۆیشتن، ئەم بزووتنەوەیە پاڵنەری زیاتر و زیاتری وەر دەگرت. ئەوکات هەڵمەتە ڕێکخراوەکان دەستیان پێ کرد و بە شێوەیەکی حەتمیش ئیمپراتۆریەتی عەرەبی بەدوای خۆیدا هێنا. لەبەر ئەوە، دامەزراندنی ئەم ئیمپراتۆریەتە بەرئەنجامێکی لۆژیکیی باروودۆخە ڕاستەوخۆکان بوو، زیاتر لەوەی بەرئەنجامی پلانبۆدارشتنێکی پێشوەختە بووبێت[1].

بەڵام دەبێت لێرەدا ئەوەمان لەیاد بێت، کە ئەو ئیمپراتۆریەتەی بەم ڕێگەیە دروست بوو، لە هەناویدا تۆوی گرفتێکی گەورەی هەڵگرتبوو. لە هیچکام لەو ئیمپراتۆریەتانە نەدەچوو، کە سارانشینەکان بوونیادیان نابوون. ئەو سارانشینانەی بەسەر نەتەوەگەلی جیاوازدا سەر کەوتن، ئەو مسوڵمانە لەخواترسانە هاودڵییان دەکردن، کە پێیان وا بوو ئەوان بوونیادنەری بیروباوەڕێکی نوێن لەسەر زەوی، لێرەدا ململانێی توندەکە لەنێوان ئەم دوو تەرزەی مسوڵماناندا

---

١ فلیب حتي، سەرچاوەی پێشوو، ص ١٤٥.

سەری هەڵدا، کە لە سەرەتای ئەم بەشەدا باسمان لێوە کردن.

مسولمانە یەکەمینەکان، ئەوانەی بە دڵسۆزییەکی قووڵ و خۆبەختکردنێکی زۆرەوە باوەڕیان بۆ ئیسلام کردەوە، سوودیان لە ژینگەی نێو ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی وەر گرت و دەستیان کرد بە بانگکردنی خەڵکی بۆ ئایینە خۆشەویستەکەیان. – لەلایەکی دیکەوە – سارانشینەکان گوێیان بەوە نەدا یەک هەنگاوی جیددی بەرەو بانگەوازی ئایینی بنێن، لە ڕوانگەی ئەوانەوە، ئایینی حەق، ئەو ئایینەیە کە سەرکەوتنیان بۆ دەهێنێت. لە ڕوانگەی ئەوانەوە، بانگەواز هیچ مانایەکی نییە، بەڵکوو تەنها شمشێر ڕێنیشاندەری حەقە، تەنانەت هەندێک سەرکردەی سارانشین، ڕقیان لە بانگەواز بوو، لە ڕاستییشدا لە هەندێک حاڵەتدا ڕێگرییان لە کەسانی ژێردەستیان دەکرد باوەڕ بە ئیسلامدا بکەن، لەسەر ئەو بنەمایەی ئیسلامبوونیان، دەبووە هۆی کەمبوونەوەی ئەو جزیەیەی لێیان دەسەندن، ئەم باسەش مسولمانانی ئەو کاتەی بەصرەی هێنایە گریان[1]. خەلیفە عومەری دووەم (عومەری کوڕی عەبدولعەزیز) جارێک پەیامێکی بۆ یەکێک لە ویلایەتەکان نارد، تیایدا هاتبوو: "خودا محەمەدی وەک ڕێنیشاندەری خەڵکی ناردووە، نەک وەک جزیەکۆکەرەوە[2]."

یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام، یەکسانییە لەنێوان باوەڕدارانبدا، وەک قورئان دەڵێت: (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*، ص ٩٢.

٢ يحيى أبو يوسف، *كتاب الخراج*، ص ١٥.

أَتْقَاكُمْ)[1] واتا: (... بەڕاستی بەڕێزترینتان لای خودا، ئەو کەسانەتانە کە زۆرتر لەخواترسە و فەرمانبەرداری خوایە...)[2]. بەلام سارانشینەکان بە سووکی و دڕندەیی و ستەمکارانە مامەلەیان لەگەل ئەو مسولمانانەدا دەکرد، کە تازە هاتبوونە نێو ئیسلامەوە[3]. سیر بیرسی سایکس دەلێت:

ئەو بەسووکدانانەی فەتحکاران بەرامبەر ئەو گەلانەی ملیان پێ کەچ کردبوون، زۆر لەو بەسووکدانانە بەهێزتر بوو، کە نۆرمانەکان بەرامبەر سەکسۆنییەکان نیشانیان دا، ئەمەش لە وتەیەکیاندا بەڕوونی دەر دەکەوێت، کە دەلێت: "سێ شت نوێژ بەتال دەکەنەوە: ئەگەر ژێردەستە، گوێدرێژ و سەگ بەلای نوێژکەردا تێپەر ببن[4]."

با چەند دێڕێکیش لە پرۆفیسۆر نیکۆلسن وەر بگرین، کە وەک بەلگەیەک لە مێژووی عەرەبیدا هەژمار دەکرێت:

پێیان وا بوو بە باوەشکردن بە ئیسلامدا، ڕێزیان لێ دەنرێت لەلایەن فەتحکارانەوە، بەلام بەهەلەدا چووبوون. مسولمانە نوێکان کرانە ژێردەستەی یەکێک لە خێلە عەرەبییەکان، نەیانتوانی لەگەل

---

١ سورة الحجرات، الآية: ١٣.

٢ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥١٧. (و. ک.)

٣ أحمد أمین، ضحی *الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢٦. روبن لیفي، *سوسیولوجیا الإسلام*، المجلد الأول: ص ٨٢ و دواتر. فلیب حتي، *تاریخ العرب*، ص ٢٣٢.

٤ السیر بیرسي سایکس، *تاریخ بلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٥٣٦.

مسوڵمانانی پێشیندا یەکسان بن، لەبریی ئەوەی ئەو مافی یەکسانییە بەدەست بهێنن کە دەیانخواست و بەپێی پرنسیپی ئیسلامیش پێویست بوو بەدەستی بهێنن، ژێردەستەکان لەلایەن گەورەکانیانەوە بەسووک سەیر دەکران، پێویست بوو ئەوانیش مل بۆ تەواوی جۆرەکانی سووکایەتییکردنی کۆمەڵایەتی کەچ بکەن. لەبریی ئەوەی لە خەراج و جزیەش ببەخشرێن، کە ناسسوڵمانان دەیاندا، بەڵام لەلایەن بەرپرسانی حکومەتەوە ئەو باجانەیان لەسەر زیاد کرا[1].

لەبەر ئەوە، ڕەوشەکە پرمەترسی بوو، دامەزرێنەری کۆمەڵناسیی مەعریفە (ماکس شیلەر) ئەوەی بۆ دەر کەوتووە، کە بێزاری بە شێوەیەکی تایبەتی لەو کۆمەڵگەیانەدا بڵاو دەبێتەوە، کە پڕن لە ئایدیۆلۆژیاگەلێک، کە بانگەشە بۆ یەکسانی دەکەن، بەڵام لە بوونیادی کۆمەڵایەتیی فیعلیدا، ئەم یەکسانییە بوونی نییە[2]. ئەوەی پەیوەستە بە توێژینەوەکەمانەوە سەبارەت بەم بابەتە، بوونی ڕێنمایی شکۆدارە، کە بانگەشە بۆ یەکسانی دەکەن لە ئیسلامدا، هاوشان لەگەڵ مامەڵەی نادادپەروەرانە لەنێو خەڵکی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامدا، بە شێوەیەکی سروشتی بەرەو بەریەککەوتنی ئایدیۆلۆژیاکان ڕۆیشتن لەنێوان ستەمکار و ستەملێکراودا، بەمەش هەلێک بۆ هاتنەئارای ئایینێکی نوێ

---

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ٢٤٨.

٢ جیرالد دو غریە، *المجتمع و الآیدیولوجیا*: ص ١٠-١١.

رەخسا، کە چینە ستەملێکراوەکان لەو ئایینەدا هەتوانێک بەدی بکەن بۆ برینەکانیان، لەمەوە مەزهەبی شیعە بە بروا ئایدیالییەکانی و یاخیبوونە لاوازەکەیەوە دەر کەوت.

لەوەیە سوودبەخش بێت ئەگەر سەرنج لەو وڵاتە بدەین، کە یەکەم جار شیعەگەریی تێدا دەر کەوت، هەروەها لەو هۆکارانەش بکۆڵینەوە، کە بوونە هۆی دەرکەوتنی لەو وڵاتەدا، نەک لە وڵاتێکی دیکە.

فلیپ هیتی ئاماژە بەوە دەکات، عێراق - لەنێو تەواوی وڵاتانی ئیسلامیدا - ئەوەی چەسپاند، کە بەپیتترین خاکە بۆ گەشەکردنی بیروباوەڕی شیعەگەری[1]. چەند بەڵگەیەکی دیاریکراویش لە بەردەستدان، ئاماژە بەوە دەکەن، عێراق زیاتر لە هەر جێگەیەکی دیکەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی، بایەخی بە ڕێنماییەکانی یەکسانی داوە. بە واتایەکی دیکە، عێراق ژمارەیەکی ناسروشتی لەو مسوڵمانە فەتحکارانە لەخۆ گرت، کە بەتوندی باوەڕیان بە یەکسانی و برایەتیی نێوان مسوڵمانان هەبووە، لەمەدا جیاوازی لەنێوان مسوڵمانە عەرەب و بیابانییەکاندا نەبوو.

سەردەمانێک لە کوفەدا، کە مسوڵمانە فەتحکارەکان بوونیادیان نا و کردیانە سەربازگەی سەرەکیی خۆیان لە عێراقدا، سەد و حەوت هاوەڵی پێغەمبەری تێدا ژیاوە[2]. بە لایەنی کەمەوە، حەفتا کەسیان لەو سارانشینانە بوون، کە لەگەڵ پێغەمبەردا بەشداریی جەنگی بەدریان کردبوو، لە

---

١ فلیپ حتي، *تاريخ العرب*، ص ٢٤٩.

٢ حسین براقي، *تاريخ الكوفة*: ص ٢٨٤ و دواتر.

کاتێکدا سەرکەوتنی دونیاییی ئیسلام کارێک بوو، گومانی زۆری هەڵدەگرت[1]، ئەگەر بزانین ژمارەی تەواوی بەدرییەکان لە سەرەتای جەنگی بەدردا سێسەد و پێنج کەس بوون[2]، زۆرێکیان کوژران یان بەر لەوەی کوفە بوونیاد بنێن مردن، واتە بەر لە حەڤدە ساڵ، درک بەو ژمارە زۆرەی بەدرییەکان دەکرێت، کە لە شاری کوفە دەژیان، بە بەراورد بەو بەدرییانەی لە ناوەندەکانی دیکەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا دەژیان.

قورەیشییەکانیش - ئەرستۆکراتەکانی مەککە، ئەوانەی دوای سەرکەوتنی ئیسلام هاتنە نێویەوە - ئەستەم بوو لە کوفە بەدی بکرێن، زۆرینەیان روویان کردە شام[3]، ئەمەش ئەو راستییەیە، کە دەکرێ -ئەگەر کەمەکێکیش بێت- ئەو فاکتەرانە روون بکاتەوە، کە وای لە سورییەکان کرد بە شێوەیەکی گەورە فەرمانبەرداری حکومەت بکەن و گوێ بە هیچ جۆرێک لە جۆرەکانی ناکۆکی نەدەن. بە هەرحاڵ، سوبەیتی وای دەبینێت، بڵاوبوونەوەی شیعەگەری لە بەشی باشووری کەناری سوریا، هۆکەی دەگەڕێتەوە بۆ بانگەوازی ئەبی زەری غەففاری، کە خەلیفە بە هۆی هزرە هاندەرەکانییەوە، کە بانگەشەی یەکسانی و دادپەروەریی کۆمەڵایەتیی دەکرد، دووری خستبووە[4].

---

١ سەرچاوەی پێشوو: ص ١٠٨.

٢ درويش مقدادي، *تأريخ الأمة العربية*: ص ٨٨.

٣ محمود عباس العقاد، *أبو الشهداء*: ص ٣٧. إبن خلدون، *كتاب العبر*، المجلد الثالث: ص ٣ و دواتر.

٤ عبدالله السبيتي، *أبو ذر*: ص ١٣٦.

لە ڕاستیدا، مێژوونووسە عەرەبەکان لە نەزعەی تایەفەگەریی عێراق و خۆشەویستییان بۆ یاخیبوون لە حکومەت، وا ڕاهاتوون عێراق بە سوریا بەراورد بکەن. وتەیەکی بەناوبانگ لەسەر ئەم نەزعەیەی خەڵکی عێراق هەیە، کە مسوڵمانان لەسەری ڕاهاتوون و قبوڵیان کردووە و لە باپیرانیانەوە بۆیان ماوەتەوە، بێ ئەوەی پرسیار لە هۆکارەکانی بکەن، ئەم وتەیە دەدرێتە پاڵ حەجاجی کوڕی یوسفی سەقەفی -کە یەکێکە لە بەناوبانگترین فەرمانڕەواکانی عێراق لە سەدەی یەکەمی کۆچیدا- حەجاج لە یەکەم وتاریدا وتوویەتی: "ئەی خەڵکی عێراق، ئەی خەڵکی دووبەرەکی و پەرتبوون..."

جاحیز -کە یەکێکە لە مەزنترین نووسەر و بیریارەکانی عەرەب (١٥٠-٢٥٥ کۆچی)- هەوڵی داوە خۆشەویستیی عێراقییەکان بۆ پەرتبوون، بۆ فێڵبازییان بگێڕێتەوە. بانگەشەی ئەوەی دەکرد، عێراقییەکان زۆر لە خەڵکی شام زیرەکترن "خەڵکێکی لێهاتوو و زیرەکن[١]." ئەحمەد ئەمین ئەم تایبەتمەندییە دەگێڕێتەوە بۆ ئەو ڕاستییەی زۆرینەی شۆڕش و جەنگە نێوخۆییەکانی ئیسلام لە عێراق ڕوویان داوە[٢]. پێدەچێت ئەحمەد ئەمین بەم لێکدانەوەیەی، هیچ شتێکی چارەسەر نەکردبێت، تا هەنووکەش ئەم پرسیارە پێویستی بە وەڵام هەیە، بۆچی عێراق گۆڕەپانی ئەم هەموو شۆڕشانە بووە؟

---

١ عمرو بن بحر بن محبوب الجاحظ، *البیان والتبیین*، المجلد الثاني: ص ٩٤.

٢ أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ١٨٢-١٨٣.

خۆرهەڵاتناس ڤیدا، سەرەتاکانی ئەم شۆڕشانەی کە دژی خەلیفەی سێیەم (عوسمانی کوڕی عەففان) ئەنجام دران، دەگێڕێتەوە بۆ هۆکارگەلێکی ئابووری، ڤیدا دەڵێت:

> بە هەرحاڵ، تەنها لەم قۆناغەدا یەکەمین شۆڕش لە عێراق دەستی پێ کرد، ئەو وڵاتەی زۆر بەدەست قەیرانی ئابوورییەوە دەیناڵاند و ئەو وڵاتەی رەگەزە شلەژاوەکانی جۆراوجۆرتر بوون[1].

ئێمە وای دەبینین، فاکتەری ئابووری بەتەنها بەس نییە، ڕاستە لەو کاتەدا قورسایی باج لەسەر خەڵکی جووتیاری عێراقی گەورە بووە، بە پلەیە، زۆرینەیان زەوییەکانیان جێ هێشت و چوونە پاڵ پرۆلیتاریای شار[2]. بەڵام ئەو خاڵەی پێویستە لێرەدا جەختی لەسەر بکەینەوە، ئەوەیە کە چەوساندنەوە و ئیستیغلالکردن بەتەنها بێزاری یان نارەزایی دروست ناکەن، فاکتەری ڕاستەقینەی بێزاری، بڕوابوونی پتەوی ئەو کەسە چەوساوانەیە، بەوەی بە یەکسانی مامەڵە ناکرێن و بەشێوەیەکی نادادپەروەرانە ستەمیان لێ دەکرێت، دوغریە دەڵێت:

> چەوساندنەوە و بەکەمزانین بەتەنها نابنە هۆی بێزاری، بەڵکوو پێویستە هەستێکی بەهێزی بایەخدانی کەسی و ئامادەباشیی خودی لەگەڵدا بێت، وەک ماکس شیلەر ڕوونی دەکاتەوە،

---

١ ل. د. ڤیدا، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثالث، ص ١٠١٠.

٢ بگەڕێرەوە بۆ: یحیى أبو یوسف، *كتاب الخراج*: ص ٥٧. أحمد أمین، سەرچاوەی پێشوو: ص ٩٢. جورجي زیدان، *تأریخ التمدن الإسلامي*، المجلد الثاني: ص ٨٦ و دواتر.

> سیستمی چینایەتیی ڕەگداکوتاو و باوەڕهێنان بە ستەم لە هیندستان نەبوونەتە هۆی بێزاری لەنێو دەستە ملکەچەکانی ئەو کولتوورە، ئەمەش بەدیاریکراوی دەرخەری ڕاستییەکە، ئەویش ئەوەیە، کە بانگەشەکردن بۆ یەکسانی لەنێوان چینەکاندا بوونی نییە و تاکەکانی چینە نزمەکان پێیان وایە پێگەکەیان شتێکی سروشتیی دروستە[1].

مێژوو ئاماژە بەوە دەکات، جووتیارە عێراقییەکان لەسەر ئیستیغلالکردنیان لەلایەن سارانشینەکانەوە ڕاهاتبوون، تەنانەت بەر لە داگیرکاریی عەرەبیش بە ماوەیەکی زۆر. دەکری هەندێک ڕاستی لەو بۆچوونەدا هەبێت، کە دەڵێت، عێراقییەکان لە یەکەمینەکانی ئەو نەتەوە کشتوکاڵییانە بوون لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، کە بەدەست هەژموونی سارانشینییەوە ناڵاندوویانە، دەشکرێت لە هەر نەتەوەیەکی دیکەی جیهان زیاتر ڕووبەڕووی داگیرکاریی سارانشینەکان بووبێتنەوە، کە لە بیابانەکانی چواردەوریانەوە دەهاتن. ئێچ. جی. ویلز دەڵێت:

> گۆڕانی نشینگەکان و فتوحاتە سارانشینییەکان و ڕێکخستنی کۆمەڵگە، فتوحاتە نوێکان و سەرلەنوێڕێکخستنەوەی کۆمەڵگە، کە ئەم قۆناغەی مێژووی پێ جیا دەکرێتەوە، دەتوانرێت بە شێوەیەکی تایبەتی لە ناوچەی دیجلە و فورات بەدی بکرێت، کە لە هەموو لایەکەوە بەسەر

---

[1] جیرالد دو غریە، *المجتمع و الآیدیولوجیا*، ص ١٢.

ناوچەگەلێکی فراواندا کراوەتەوە، کە بەتەواوەتی وشک نییە تا ببێتە بیابانێکی تەواو، لەگەڵ ئەوەشدا، وەک پێویست بەپیت نییە بژێویی کۆمەڵگە شارستانییەکان دابین بکات. لەوانەیە سۆمەرییەکان یەکەمین نەتەوە بن، کە شاری راستەقینەیان لەم بەشەی زەوی دروست کردووە[1].

کەواتە عەرەبەکان دوای چەندین شەپۆلی داگیرکاریی سارانشینی هاتنە عێراق، ئەم شەپۆلە جیاواز بوو لەوانەی پێشتر. تەنها شەپۆلێکی سارانشینی نەبوو، بەڵکوو هاوشان لەگەڵ جەنگاوەرە سارانشینەکاندا، جۆرێکی دیکە لە نەتەوەی لەگەڵ خۆیدا هێنا. ئەو نەتەوانە هێندەی بایەخیان بە بانگەوازکردن دەدا بۆ ئایینە نوێکەیان، هێندە بایەخیان بە شەڕکردن نەدەدا.

هەندێک لە مێژوونووسان ئاماژە بەوە دەکەن، ژێردەستەکان لە سارانشینەکان زیاتر بڕوایان بە ئایینە نوێکەیان هەبووە[2]. بڕوامان وایە هۆکاری ئەمە ئەوەیە، کە ژێردەستەکان ئایینەکەیان لە باوەڕدارە چاکەکارەکان وەر گرتووە، نەک لە سارانشینەکان. سەرباری ئەمەش، دەکرێ وەک چەکێک دژی فەتحکارە لووتبەرزەکان، ئیسلامیان لەباوەش گرتبێت. کەواتە دەکرێ بوترێ، سارانشینەکان لەگەڵ خۆیاندا تۆوی لەناوچوونی خۆیان هێنابێت، ئەوان لەگەڵ خۆیاندا گرفتیان هێنا.

***

---

١ هـ. ج. ویلز، *مختصر التأریخ*: ص ١٦٤.

٢ إبن عبد ربه، *العقد الفرید*، المجلد الثاني: ص ٩٠-٩١، لە کتێبی (أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ٨٢-٩٤) وەرگیراوە.

بە هەرحاڵ، دیاردەیەکی دیکەش هەیە، کە دەکری سەرنجمان رابکێشێت، لەوەدا کە پەیوەستە بە جیاوازیی نێوان عێراق و سوریاوە. تێبینیی ئەوە دەکەین، زۆرینەی ئەو فەتحکارە مسوڵمانانەی هاتوونەتە عێراق، بنەچەیەکی سارانشینیی ڕەسەنیان نییە، زۆرێک لە خێڵەکان لە باشووری دوورگەی عەرەبیی -یەمەن-ەوە هاتوون[1]. پێویستە لێرەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە یەمەن ئەوکات و ئێستاش وڵاتێکی کشتوکاڵییە و خاوەن مێژوویەکی دووردرێژە لە شارستانیەت و کولتووری سەقامگیری، بەر لە هاتنی پێغەمبەر محەمەد[2].

گۆلدتسیهەر، لە ڕووی مەیلە ئایینییەکانەوە، عەرەبی باشوور و عەرەبی جەرگەی دوورگەی عەرەبی لێکدی جودا دەکاتەوە، وای دەبینێت باشوورییەکان زۆر ئاییندارترن[3]. وەک شتروتمان دەڵێت، شیعە یەکەمینەکان لە عەرەبی باشوور بوون[4].

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سوریا، دەبینین زۆرینەی ئەوانەی فەتحیان کرد، عەرەبی قورەیشی بوون، یاخود سەر بە قورەیشییەکان بوون – لەوانەی بە هیچ شێوەیەک بڕوایان بە یەکسانیی نێوان خەڵکی نەبوو. ئیبن خەلدوون لە کتێبەکەیدا،

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ١٨٠.

٢ فلیب حتي، سەرچاوەی پێشوو، الفصل الخامس. درويش مقدادي، *تاريخ الأمة العربية*، الفصل الرابع.

٣ ت. هـ وایر، بند (الجاهلية)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الأول: ص ٩٩٩.

٤ ر. شتروتمان، بند (الشيعة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ٣٥٣.

*میلرپر*، چیرۆکێکی درێژمان بۆ دەگێڕێتەوە، کە بەڕوونی وێنای ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژییەی کردووە، کە لەنێوان قورەیشییەکانی سوریا و یەمەنییەکانی عێراقدا هەبووە[1].

ڕاستە نەوەکانی عەلی، کە ئەوسا و ئێستاش عێراقییەکان ڕێزیان دەگرن، قورەیشین، بەڵام پێویستە ئەوەش لەبیر نەکەین، ئەوان سەرباری ئەوەی لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە دەچنەوە سەر پێغەمبەر، سەر بە لقێکی دیاری قورەیشیشن، کە بە ڕای زۆرێک لە مێژوونووسان، لەوانی دیکە زیاتر مەیلیان بۆ ئایین هەبووە[2].

خەلیفەی چوارەم (عەلی کوڕی ئەبی تالیب)، کە کوفەی کردە پایتەختی خۆی، قورەیشییەکان بە گەورەترین دوژمنی خۆی هەژمار دەکات[3]. لە ڕاستیدا هاتنی خەلیفە عەلی بۆ عێراق، خۆی لە خۆیدا یەکێکە لەو فاکتەرە گەورانەی وایان کرد ئەم وڵاتە ببێتە زەوییەکی بەپیت بۆ دروستبوونی مشتومڕی تایەفی. لە بەشی شەشەمدا، کەسێتیی بەرزی عەلی و پەیوەندیی بە گرفتی ئیسلامەوە بەدی دەکەین. لێرەدا تەنها ئاماژە بە کاریگەریی گەورەی عەلی دەکەین لەسەر دەرکەوتنی بێزاری بە شێوەیەکی گشتی و گەشەکردنی شیعەگەری بە شێوەیەکی تایبەتی لە عێراقدا.

---

١ تەواوی چیرۆکەکە لە کتێبی (إبن خلدون، *کتاب العبر*، المجلد الثاني، ص ١٤٠) بخوێنەرەوە.

٢ محمود عباس العقاد، *أبو الشهداء*: ص ٤٩ و دواتر. چ. أوساني، *الموسوعة الکاثولیکیة*، بند (الجزیرة العربیة)، المجلد الأول: ص ٦٧٢.

٣ محمد عبده، *نهج البلاغة*، المجلد الثاني: ص ١٠٣. أحمد أمین، *فجر الإسلام*: ص ١٤٨

عەلی تەنها بانگەشەی بۆ یەکسانی نەدەکرد، بەڵکوو لە هەڵسوکەوتە کەسییەکانیشیدا نموونەیەکی واقیعیی لەسەر یەکسانی پێشکەشکرد. لەگەڵ تەواوی خەڵکیدا بەیەکسانی مامەڵەی دەکرد، بە چاوپۆشین لە ئیتن و ڕەچەڵەک و سامان و تەنانەت ئاینیشیان. ئەو ڕاهاتبوو بەشێک لە کاتە دەستبەتاڵییەکانی لە دوکانی میوەفرۆشێکی هاوڕێی بەرێتە سەر، کە خورمای دەفرۆشت، تەنانەت کاتێک هاوڕێکەی لە دوکان نەدەبوو، لەبریی هاوڕێکەی خۆی خورمای دەفرۆشت[1].

دەگێڕنەوە ڕۆژێک عەلی قەڵغانەکەی ون دەکات و دواتر لای نەسرانییەک دەیدۆزێتەوە، نەسرانییەکە دەباتە لای قازیی کوفە، لەبەر ئەوەی عەلی شایەتێکی بۆ سکاڵاکەی نەبوو، قازیی کوفە سکاڵاکە لە بەرژەوەندیی نەسرانییەکە یەکلایی دەکاتەوە. نەسرانییەکە قەڵغانەکەی عەلی دەبات و خەلیفەش سەیری دەکات.

عەلی ڕەچەڵەکی خۆی و تەواوی قورەیشییەکان دەگێڕێتەوە بۆ گوندێکی زۆر بچووکی عێراق[2]. زانا مسوڵمانەکان تا هەنووکە سەریان لە مەبەستی ڕاستەقینەی عەلی سووڕ ماوە، چونکە قورەیش لەنێو عەرەبەکاندا بە خانەدانترین خێڵ هەژمار دەکرێت. ئەحمەد ئەمین بڕوای وایە، عەلی بانگەشەی ئەوەی نەکردووە، بەڵکوو ژێردەستەکان ئەم چیرۆکەیان بۆ هەڵبەستووە، وەک پەرچەکردارێک بۆ ئەو عەرەبانەی زۆر شانازییان بە ڕەچەڵەکی خۆیانەوە دەکرد و بەسووکییەوە لە

١ حسين براقي، *تأريخ الكوفة*: ص ٢٨٦.
٢ أ. م. أكد، *عبقرية الإمام*: ص ٤٠-٤١.

ژێردەستەکانی خۆیانیان دەروانی لە عێراقدا[1].

بێگومان ئەو کاتە کەمەی خەلیفە عەلی لە عێراقدا بردیە سەر، وای لە ژێردەستەکان کرد لە مامەڵەی دادپەروەرانەدا بەرامبەر مافەکانیان هۆشیار بن، هەروەها چاویشیانی بەرامبەر پرنسیپە راستەقینەکانی ئیسلام کردەوە.

جێی سەرنجە، ژێردەستەکان راستەوخۆ دوای مردنی عەلی، تووشی ستەمێکی گەورە هاتن. معاویە، کە راستەوخۆ دوای عەلی خیلافەتی لە پایتەختی خیلافەت لە شامدا گرتە دەست، رۆژێک لە رۆژان وتوویەتی:

> سەرنجمدا سوورپێستەکان[2] زیادیان کردووە، پێم وایە لە پێشینەکان لایان داوە، وەک ئەوە وایە بەسەر عەرەب و سوڵتاندا بازیان دابێت، بۆیە وام بە باش زانی نیوەیان بکوژم و واز لە نیوەکەی دیکەیان بهێنم بۆ بوونیادنانی بازار و رێگاوبان[3].

لەبەر ئەوە، نامۆ نییە ئەگەر ببینین یادکردنەوەی عەلی دوای مردنی، لەنێو ژێردەستەکانی عێراقدا بەرز و پیرۆز رادەگیرێت. وشەی شیعە (الشیعة) لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (شوێنکەوتوو) دێت، لە بنچینەشدا بۆ ئاماژەدان بە شوێنکەوتووانی عەلی بەکار هێنراوە[4]. خەڵکی عێراق تا هەنووکەش عەلییان زۆر خۆش دەوێت، گۆڕەکەشی لە

---

١ أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ٧٦.

٢ سوورپێست: مەبەست لە فارسەکانی ناو ئیسلامە. (و. ک.)

٣ إبن عبد ربە، *العقد الفريد*، المجلد الثاني: ص ٩٠. لە کتێبی (أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ٩٠)ەوە وەرگیراوە.

٤ ر. شتروتمان، بند (الشيعة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ٣٥٠.

نەجەف، یەکێکە لە پیرۆزترین شوێنەکانی عێراق، زۆرینەی عێراقییەکان حەز دەکەن دوای مردنیان لای گۆڕی پێشەوا خۆشەویستەکەیانەوە بەخاک بسپێردرێن.

بەر لەوەی کۆتایی بەم بەشە بهێنین، پێویستە ئەوە روون بکەینەوە، کە ژێردەستەکانی عێراق، وەک پرۆفیسۆر نیکۆلسن روونی دەکاتەوە، بەهەڵە بانگەشەی ئەوەیان کردووە، کە فارسن[1]. بڕوامان وایە بۆیە ڕەچەڵەکێکی فارسییان بۆ خۆیان دروست کردووە، تا لە بنەچەی خانەدانی فاتحکاران کەم بکەنەوە.

دەشێ ئەم هۆکارە وای لە دوژی کردبێت، شیعەگەری بۆ بنەچەیەکی فارسی بگێڕێتەوە، لە ڕاستیدا فارسە ڕاستەقینەکان، بە بەراورد بە ژێردەستەکانی عێراق، درەنگتر ڕوویان کردۆتە شیعەگەری. چەند بەڵگەیەکی مێژوویی لە بەردەستدان ئەوە ڕوون دەکەنەوە، کە زۆرینەی فارس، ماوەیەکی زۆر دوای مسوڵمانبوونیان لەسەر مەزهەبی سوننە ماونەتەوە[2]. فارسەکان لە کاتی فەرمانڕەوایی سەفەوییەکاندا، کە لە سەدەی دەیەمی کۆچیدا فەرمانڕەواییان کردووە، بەکۆمەڵ بوونەتە شیعە. سایکس وای دەبینێت، کە شا ئیسماعیلی سەفەوی (٩٠٥--٩٣٠ کۆچی، ١٤٩٩-١٥٢٤ زایینی) شیعەگەریی کردووە بە مەزهەبی فەرمی لە وڵاتی فارسدا[3].

پێویستە لێرەدا جیاوازی بکەین لەنێوان شیعەگەری لە وڵاتی فارسی ئەمڕۆ و شیعەگەری لە عێراقی ڕۆژانی

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*: ص ٢٧٩.
٢ محمد أمین الزین، *الشیعة في التاریخ*: ص ١٥٠ و دواتر.
٣ سەرچاوەی پێشوو: ص ١٥٤.

سەرەتادا. دوای ئەوەی شیعەگەری بوو بە مەزهەبی فەرمی، بەدڵنیاییەوە ئەو شەوق و چالاکییەی لە ڕۆژانی یەکەمیدا هەیبوو، لەدەستی دا. ئیدی شیعە ئایینی ستەملێکراوان نەما، کە وەک مەرهەمێک بۆ هەستە بریندارەکانیان دەیانبینی، بەڵکوو بووە مەزهەبی دەوڵەت، یاخود بەپێی پۆلێنکردنی ترویلتاک، بووە (کڵێسا) - دامەزراوەی ئایینی - کە پێشتر (مەزهەب)ێک بوو[1].

لەوەیە پەیوەندیی بە بابەتەکەمانەوە هەبێت، کە لێرەدا چەند دێڕێک لە یەنگر وەر بگرین دەربارەی جیاوازییەکانی نێوان کڵێسا - دامەزراوەی ئایینی - و مەزهەب:

> کڵێسا "بەسەر جیهاندا زاڵ دەبێت، چونکە ڕەوتی دونیایی بەسەریدا زاڵە." بەڵام مەزهەب "ئایینێکی سادەیە و خاڵییە لە دەسەڵاتی دونیایی" و "مەیلی بەرەو ئەوەیە ببێتە ڕادیکاڵ" و "زۆر جاریش پەیوەستە بە چینە هەژارەکانەوە[2]."

پێدەچێت ئەم پەرەسەندنە لە شیعەگەریدا شتێکی حەتمی بووبێت، زۆر بەدەگمەن مەزهەبێک تاهەتایە بەمەزهەبی دەمێنێتەوە. لێرەدا دەتوانین لەسەر ئاستێکی باڵا تیۆریی دیالێکتیکیی هیگڵی پراکتیزە بکەین، دەکرێ لە سەرەتادا ئایین وەک مەزهەبێکی ئایدیالی بێتە ئارا، کە ستەملێکراوەکان دژی دامەزراوە ئایینییە فەرمییەکەی چەوسێنەرانیان بوونیادی دەنێن، بەڵام بەخێرایی شوێنکەوتەیەکی زۆری بۆ پەیدادەبێت،

---

١ میلتون ینغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: ص ٨.

٢ سەرچاوەی پێشوو: ص ١٩.

ئەوکات وەک دامەزراوەیەکی ئایینیی سەربەخۆ خۆی رادەگەیەنێت و لای خۆشیەوە ئەو گروپە داهێنەرانەی تر دەچەوسێنێتەوە، کە نوێن. بەنگر بەردەوام دەبێت و دەڵێت:

> بە هەرحاڵ، پێویستە ئەوەمان لەیاد بێت، کە دامەزراوەی ئایینیی (کڵێسا) و مەزهەب، یەکێکیان دەرژێتە ئەوی دیکەیانەوە، مەزهەب لە هەندێک رووکاری ڕێساکانی دامەزراوەی ئایینییەوە دروست دەبێت و گەشە دەکات، ئەگەر بیەوێت لە ڕێڕەوی مێژوودا بەردەوامیی بە مانەوەی خۆی بدات، پێویستە دووبارە پەرە بستێنێت بۆ دامەزراوەیەکی فەرمی[1].

لەوانەیە سوودبەخش بێت ئەگەر لێرەدا سەرنجتان بۆ ئەوە ڕابکێشین، کە لە وڵاتی فارسدا و لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەدا، ئایینێکی نوێ دەر کەوت، کە لە شیعەگەرییەوە گەشەی کرد، لەژێر ناوی (بابیزم)، بەم دواییانەش پەرەی سەند بۆ مەزهەبی بەهائی[2].

---

١ میلتون ینغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: ص ١٩.

٢ السیر بیرسي سایکس، *تاریخ بلاد فارس*، المجلد الثاني: ص ٢٤١ و دواتر. دوایت دونالسون، *المذهب الشیعي*، الفصل ٣٣.

پێدەچێت لەیەکچوونێکی گەورە هەبێت لەنێوان ئەو ژێردەستانەی لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا پەنایان بردە بەر شیعەگەری وەک پەرچەکردارێک دژی ستەمکارانیان، لەگەڵ ژێردەستەکانی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا، ئەوانەی پەنایان بردە بەر مەسیحیەت. ڕۆبن لیفی زۆر لەمە دوورتر دەڕوات و پێگەی ژێردەستە مسوڵمانەکان بە پێگەی ڕەشپێستەکانی ویلایەتەکانی باشووری ویلایەتە یەککرتووەکانی ئەمەریکا بەراورد دەکات[1].

بەگونجاوی دەزانین لێرەدا هەندێک لە وتەکانی توینبی وەر بگرین دەربارەی پەرچەکرداری ڕەشپێستەکان دژی ئەو نادادپەروەرییانەی لە ویلایەتە یەککرتووەکاندا بەدەستیانەوە ناڵاندوویانە، ئەم پەرچەکردارەش لە پەرچەکرداری ژێردەستەکان دەچێت لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا:

> پێدەچێت ڕەشپێستەکان وەڵامی ئەو هەڕەشانە بدەنەوە، کە ڕووبەڕوومان بوونەتەوە، وەڵامدانەوەیەکی ئایینی، دەکرێ ئەوەمان بۆ بسەلمێنێت، کە لەم حاڵەتەدا کاتێک چاوی پێدا دەگێڕینەوە، لە وەڵامدانەوەی خەڵکی پێشینی

[1] ڕوبن لیفي، *سوسیولوجیا الإسلام*، المجلد الأول: ص ٨٤

خۆرهەڵات دەچێت بەرامبەر ئەو هەڕەشانەی لە گەورەڕۆمانییەکانیانەوە ڕووبەڕوویان بووە. ڕەشپێستەکان لە ڕێی دۆزینەوەی چەند واتا و بەهایەکی ڕەسەنەوە لە مەسیحیەتدا، توانییان خۆیان لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتییە نوێکەیاندا بگونجێنن، بەهاگەلێک، کە مەسیحیەتی خۆرئاوایی دەمێک بوو پشتگوێی خستبوون. ڕەشپێستەکان لە ڕێی کردنەوەیەکی ساکاری هۆشیانەوە ئەوەیان بۆ دەرکەوت، کە مەسیح پێغەمبەر بووە و هاتووە بۆ جیهان، نە لەبەر ئەوەی بەهێزەکان لە پێگەکانیاندا جێگیر بکات، بەڵکوو بۆ بەرزکردنەوەی خاکەڕاکان و خەوبینەکان، لەبەر ئەوە، دەکرێ مەسیحیەت - ئەگەر بەڕاستییش وا نەبێت - دووبارە ببێتەوە بە بیروباوەڕێکی زیندووی شارستانیەتێکی مردوو، ئەگەر هەر بەراستی ئەم چارەنووسە لە چارەی نووسرابێت لەسەر دەستی کڵێسای ڕەشپێستە ئەمەریکییەکان بێتە دی، ئەوا ئەم وەڵامدانەوەیە دینامیکییانەتر دەبێت بۆ هەڕەشەی ئەو سزا کۆمەڵایەتییانەی تا هەنووکە مرۆڤەکان ئەنجامی دەدەن[1].

ئەوەی جێی بایەخە، ئەوەیە سەرنجی ئەوە دەدەین کە توینبی چاوەڕێی ئەوە لە ڕەشپێستە ئەمەریکییەکان

---

[1] أرنولد توينبي، *دراسة في التاريخ* (النسخة المختصرة، د. س. سومرفيل)، ص ١٢٩.

دەکات ئەوە لە مەسیحیەتدا بێتە دی، کە شیعە لە ئیسلامدا هێنایانە دی. لە راستیدا شیعەکان دان بە گۆڕانکاریدا نانێن لە سروشتی ئیسلامی دوای کۆچدا، ئەوان ئێستاش وەک ئایینی ستەملێکراوان و خاکەڕاکان سەیری ئیسلام دەکەن.

لە کاتێکدا دەبینین گەورەترین بۆنە لای سوننەکان، لەدایکبوونی پێغەمبەرە، بەڵام ڕۆژی عاشوورا ئەو ڕۆژەی حسەینی نەوەی پێغەمبەر بە فەرمانی یەزید کوژرا - گەورەترین بۆنەیە لای شیعەکان. سێر پێرسی سایکس تێبینیی ئەوەی کردووە، پێشەوایانی شیعە شوێنگەیەکی گەورەتریان لە شوێنگەی پێغەمبەر هەیە لە دڵی شیعەکاندا[1]. زۆرێک لە گەڕیدە و زاناکان لەم خاڵەدا لەگەڵ سایکس کۆکن، بەڵام ئەمە بەتەواوەتی دروست نییە، ئەمە لای چاودێرێکی سەرپێیی وا دەر دەکەیت، بە هۆی ئەو ئاهەنگە گەورانەوە، کە شیعەکان بۆ یادکردنەوەی پێشەواکانیان ئەنجامی دەدەن. لە راستیدا ئەوان ئەم کارە بۆ ئەوە ناکەن، کە پێشەواکانیان بەلاوە پەسەندترە لە پێغەمبەر، بەڵکوو ئەوان پێشەواکانیان، کە خەلیفەکان چەوساندوویاننەتەوە، وەک سیمبولێکی شۆڕشەکانیان بەدیی دەکەن.

شترۆتمان بەم جۆرە باسی پاڵنەری شیعەکان دەکات:

> ئەو هەوڵانەی شیعەکان دایان، تووشی بەرهەڵستییەکی گەورە بوۆە لە کایەی سیاسیدا، بۆیە خۆیان بۆ کایەی ئایینی تەرخان کرد. ئەزموونی شیعەکان بە شێوەیەکی تایبەتی

---

١ السير بيرسي سايكس، *تاريخ بلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٥٤٤.

گونجاو بوون بۆ بەهێزکردنی ئەم پەرەسەندنە، دەبێت شەهیدبوونی یەکێک لە نەوەکانی عەلی، شەهیدێکی دیکە بەدوای خۆیدا بهێنێت، بەڵام خوێنی حسەین، کە بە شمشێری سوپای حکومەت ڕژێنرا، تۆوی دامەزراوەی شیعە بوو، دووبارە ئایین ئەو سۆزەی بەدەست هێنایەوە، کە لە سەردەمی ئەو سامانەوە، کە ژیاننامەی پێغەمبەری دوای کۆچ خستە سەر ڕێگەی خۆشگوزەرانی دونیایی، لەپێناو ئیسلامی فەرمیدا دەستبەرداری بوو و لەڕێی مردنێکی ئارامانەی دوور لە هەر جۆرە ئەهامەتییەک، کە دەکرێ بەرهەمەکەی بەم ئاراستەیە ببەخشێت، هەموو ئەگەرێکیشی بۆ گێڕانەوەی دوور خستەوە. سووربوون لەسەر هێزی ئازارەکان، بە شێوەیەکی قووڵ هاتۆتە نێو هێزی شیعەوە، بە جۆرێک ئەفسانەگەلێکی خولقاند، کە لێوانلێون لە کێشەی مێژوویی ئەستەم، وایان کرد تەنانەت ژیانی ئەو نەوانەی عەلییش، کە بە هیچ شێوەیەک دەر نەکەوتبوون، بە شەهیدبوون کۆتایی بێت، کە زۆر جار بە فەرمانی خەلیفە ژەهرخوارد دەکران[1].

لەوانەیە سوودبەخش بێت ئەگەر لێرەدا هەندێک لە وتەکانی سێر پێرسی سایکس وەر بگرین دەربارەی بۆچوونی تایبەتیی خۆی لەسەر ئەو شانۆگەرییانەی لە

١ ر. شترۆتمان، بند (الشیعة)، موسوعة الإسلام، المجلد الرابع: ص ١٣٠.

کەربەلا ڕوویان دا (لێکچوونەکان، وەک شیعەکانی عێراق ناوی دەبەن):

ئەو شانۆگەرییانەم بینی و گەواهی ئەوەش دەدەم، کە گوێگرتن لە لاوانەوەی توندی ژنان و تاڵی چەرمەسەری لای پیاوان، زۆر جێی سەرسوورمانە، بە پلەیەک، ئەستەمە نەفرەت لە شەمەری کوڕی زی جەوشەن و یەزیدی کوڕی معاویە نەکەیت، بە هەمان ئەو توندی و هەڵچوونەوە خەڵکە نەفرەتیان لێ دەکەن. بەڕاستی لەیەکچوونەکان جۆرێکن لە خەمۆکییەکی گەورە، کە ناتوانین بەسانایی وێنای بکەین. ئەو دیمەنەی من بینیم تا ماوم لە ژیاندا لە یادەوەریمدا دەمێنێتەوە[1].

پێویستە لێرەدا ئەوەش لەیاد نەکەین، کە شیعەکان بڕوایان وایە حسەین خۆبەخشانە خۆی داوە بەدەست سوپای خەلیفەوە تا بیکوژن، بۆ ئەوەی مسوڵمانان لە گوناه و تاوانەکانیان پاک ببنەوە[2].

بەدڵنیاییەوە ئەمە هەمان ئەو بیروباوەڕەمان بیر دەخاتەوە، کە لای مەسیحییەکان هەیە سەبارەت بە لەخاچدانی مەسیح. دیاردەیەکی دیکە لە شیعەگەریدا، کە دیاردەیەکی هاوشێوەمان لە مەسیحیەتدا بیر دەخاتەوە، ئەویش دیاردەی تەجەلییە، کە پەیوەندییەکی بەهێزی بە

---

١ السير بيرسي سايكس، *تاريخ بلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٥٤٢.

٢ دوايت دونالدسون، *المذهب الشيعي*، ص ٢٣٥.

پاڵنەری ئازارەکانەوە هەیە. شتروتمان دەڵێت:

> ... مردنی حسەین لای شیعەکان، ڕێگەخۆشکەر بوو بۆ بەهەشت. ئەمەش بە هۆی هزرێکی ئایینی دیکەوەیە، کە پەیوەستە بە پاڵنەری ئازارەکانەوە، وەک مێژوو دەڵێت، ئەم هزرەش تەجەلییە، واتا دەرکەوتنی بوونی خودایی لە جەستەی مرۆڤدا[1].

لێرەدا یەکێک لە گرنگترین جیاوازییەکانی نێوان شیعە و سوننە ئامادەیی هەیە. پێویستە لەم بابەتەدا ئەوە ڕوون بکەینەوە، کە پێشەوا لای شیعەکان، تەواو جیاوازە لە خەلیفە لای سوننەکان.

خەلیفە لای سوننە، تەنها فەرمانڕەوایەکی دونیایی وڵاتی ئیسلامییە و خاوەن هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی ئایینی نییە[2]. لە کاتێکدا پێشەواکانی شیعە "بێتاوانن و دوای مردنیشیان جەستەیان لەناو ناچێت و لای خوداش تکایان بۆ دەکەن[3]." ئەوان تەنها خەلیفەی دونیایی پێغەمبەر نین، بەڵکوو لەلایەن خوداوە دانراون و لە ڕووی پێگەی ئایینی و گەیاندنی سروشی خوداشەوە لە پێگەی پێغەمبەردان. بەکورتی، ئەوان سەرکردەی ئایینی و دونیایی ئەم جیهانەن[4]. سەرباری ئەمەش، ژمارەیەکی زۆری شیعە هەن بە (خەڵکی لە ڕادەبەدەر-غلو) ناو دەبرێن، کە بڕوایان وایە بەشێک لە خودا چووتە نێو جەستەی عەلی و تەواوی

---

١ ر. شتروتمان، بند (الشيعة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ٤٥١.

٢ دوايت دونالدسون، *المذهب الشيعي*: ص ٢١.

٣ السير بيرسي سايكس، *تاريخ بلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٥٤٣-٥٤٤.

٤ دوايت دونالدسون، *تاريخ بلاد فارس*: ص ٢١.

پێشەوا یەکلەدواییەکەکانی دیکەوە[1]، واتا پێشەواکان خاوەن سروشتێکی مرۆیی ڕووت نین، بەڵکوو ئەوان، بە شێوەیەک لە شێوەکان، پیاوانی-خودان، یاخود وەک شتروتمان باسیان دەکات، "بوونی خوداییین لە مرۆڤدا."

لێرەدا دەکرێ پرسیارگەلێکی گرنگ بخەینە ڕوو، ئەویش ئەوەیە "بۆچی ئەوان بەو شێوەیەن؟." ئەو فاکتەرە کۆمەڵایەتییە چییە، کە لەپشت ئەم دیاردە نامۆیەوە لە شیعە و مەسیحیەتدا ئامادەیی هەیە، لەوەشە لەپشت تەواوی شۆڕشە کارەساتبارەکانەوە وەستابێت؟

بڕوامان وایە وەڵامەکە لە تیۆرییەکەی نیتچەدا بە ناوی (بنەچەی ئاکار) ئامادەیی هەیە. ئەم تیۆرییە سەرباری ئەوەی خاوەن تیۆرییەکە لایەنگری لە فاشیزم دەکات، وەلێ لێرەدا زۆر بەسوودە. پێدەچێت زاناکانی دەروونناسی و کۆمەڵناسیی نوێ لەم خاڵەدا بەپلەی جیاواز هاوڕان لەگەڵ نیتچەدا. جیرارد دیگری دەڵێت:

> لەبریی ئەوەی چینی چەوسێنراوە هێرش بکاتە سەر چەوسێنەرە فیعلییەکەی یاخود سەپاوەکەی، تووڕەیی خۆی ئاراستەی سیستمی بەهاکان و تێڕوانینی جیهان دەکات بۆ چینی دەسەڵاتدار. ئەمە ئەو ڕقە پەککەوتوو و بێبەرهەمەیە، کە ناتوانێت خۆی لە شێوەی توندوتیژی یاخود هەڕەشەی ئاراستەوخۆدا دەر بخات دژی پەیوەندییەکانی ئەو هێزانەی لە مەیداندان، چونکە

[1] الشهرستاني، *الملل و النحل*: ص ٨١

هێز و ئازایەتی و ئامادەباشیی مێژوویی یاخود بارودۆخی کۆمەڵایەتیی باوی نییە بۆ ئەم کارە. ئەو وەرچەرخان و هەڵگێرانەوەی بەهاکان دێنێتە دی، کە نیتچە ئازایانە ناوی ناوە (دووبارە بەهادانان-Trans valuation)[1].

دەکری لەژێر رۆشنایی تیۆرییەکەی نیتچەدا باشتر لەو هۆکارە تێبگەین، کە چینە چەوسێنراوەکان سەرکردە ئایینییەکانیان بەرز دەکەنەوە بۆ ئاستی خوداوەند. ئەو سەرکردانە نوێنەرایەتیی ئەو بەهایانە دەکەن، کە چەوسێنراوەکان وەک چەکێک دژی چەوسێنەران بەکاریان دەهێنن. نیچە دەڵێت، چەوسێنراوەکان وای دەبینن کە:

> کەساسەکان خەڵکێکی باشن؛ ئازارچێژان و هەژارەکان و نەخۆشەکان و ئەوانەی خەڵکی حەز بە چارەیان ناکەن، تەنها ئەوان بەرەکەتیان هەیە، دەبی دڵسۆزی تەنها بۆ ئەوان دەر ببردرێت، بەڵام ئێوە، ئەی ئەرستۆکراتەکان، ئەی خاوەن دەسەڵاتەکان و دەستڕۆیشتووەکان، ئێوە بۆ هەتاهەتایە خراپەکارن، ترسێنەرن، ئەو تەماحکارانەن، کە تێر نابن، ئێوە کافرن. ئێوە بەرەکەتتان نییە و نەفرەتلێکراون و بۆ هەتاهەتایە تیاچوون![2]

کارل مانهایمیش هەمان بۆچوونی هەیە و دەڵێت:

---

١ جیرالد دو غریە، *المجتمع و الآیدیولوجیا*: ص ٢.
٢ فردریک نیتشە، *أصل الأخلاق*: ص ١٢-١٤.

> لە ڕوانگەی ڕاڤەکردنی بێچەندوچوونەوە، هزرەکانمان بە شێوەیەکی بێسنوور دەوڵەمەند دەکەین، کاتێک هەوڵ دەدەین لە مانای ئەم ڕستەیەی ئینجیل تێبگەین، "ئەوەی کۆتایی دەبێتە یەکەم،" پێمان وایە ئەوە گوزارشتێکی دەروونییە بۆ شۆڕشی چینە چەوسێنراوەکان... ئەمە هاوسۆزییەکی ڕاستەقینەیە تەنها بۆ ئەو کەسانەی هاوشێوەی مەسیحییەکان چەوسێنراوەن، ئەوانەی دەکەونە ژێر پاڵنەری خواستی ئازادبوون لەو ستەمەی بەسەریاندا سەپاوە[1].

پێدەچێت دەروونناس ئەبرام کاردانەریش هەمان بۆچوونی هەبێت و دەڵێت:

> لە سەرەتای مەسیحیەتدا، خودئازاردان شتێکی دیار بوو، بە شێوەیەک، ئامانجەکانی نائومێدی و چەرمەسەری و خۆپاراستن لە سێکس بەرز کرانەوە بۆ پلەیەکی نوێ لە بەهای گوزارشتکاری، تاوەکوو چەرمەسەرییەکانت زیاتر بن، پێگە کۆمەڵایەتییەکەت بەرزتر دەبێتەوە[2].

پێدەچێت ئەوەی بەسەر مەسیحییە یەکەمینەکاندا هات، تا ڕادەیەکی زۆر هەمان شت بەسەر شیعە یەکەمینەکانیشدا هاتبێت. دیاردەی تەجەلی، کە مەسیحیەکان سەبارەت بە مەسیح و شەهیدەکانی دیکە دەیبینن، لای شیعەکانیش

---

١ كارل مانهايم، *الآيديولوجيا و اليوطوبيا*: ص ٢٢-٢٣.

٢ أبرام كاردانير، *الفرد و مجتمعه*: ص ٤٤٧.

سەبارەت بە پێشەوا عەلی و نەوەکانی دەبینین، وەک پێشتر باسمان لێوە کرد، ئەو شیعانەی سەر بە چینە چەوسێنراوەکانن لە ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا، وەک بریکاری شەیتان سەیری خەلیفەکان و هاوکارەکانیان دەکەن، لە کاتێکدا ئەو نەوانەی عەلی، کە چەرمەسەریی زۆریان چەشتووە و لەلایەن خەلیفەکانیشەوە چەوسێنراونەتەوە، بەرز دەکەنەوە بۆ پلەیەکی نزیک لە خودا. ئەمە هەمان ئەو شتەیە، کە ئینجیل باسی دەکات، "ئەوەی کۆتایی دەبێتە یەکەم." دەکری -بە واتایەکی دیکە - نەوەکانی عەلی وەک بەرجەستەکەری ئەو نموونە بالایانە هەژماربکەین، کە شیعەکان بروایان پێیان هەیە وەک پەرچەکردارێک دژی ستەمکاران. سیر پیرسی سایکس دەربارەی ئەو ململانێیەی لەمەوە دێتە دی، دەڵێت:

> پێویستمان بەوە نییە بڵێین ئەم جۆرە بیروباوەرە، ئەو کەسانەی باوەڕیان پێیەتی دەکاتە دوژمنی سەرسەختی کیانی گشتیی ئەو مسوڵمانانەی لە بیروباوەڕیاندا پشت بە دەسەڵاتی پێغەمبەر و خەلیفە یەکەمینەکان دەبەستن، لەنێویشیاندا عەلی، وەک دواتر دەیبینین، چەندین جەنگی خویناوی لەنێوان شیعە و سوننەدا ڕووی دا، هاوشێوەی جەنگی نێوان کاسۆلیکەکانی ئیسپانیا و پرۆتستانتەکان، پێدەچێت یەکێتیی نێوان ئەم دوو گروپە مەزنەی جیهانی ئیسلامی لە ئەمڕودا، زیاتر لە هەرکاتێکی

دیکەی ڕابردوو، ئەستەم بێت. گرنگە سەرنجی ئەوە بدەین، موجتەهیدە سوننەکان شوێن ڕاڤە شەرعییەکانی پێشەواکانی هەرچوار مەزهەبەکە؛ حەنبەلی، شافیعی، حەنەفی و مالیکی دەکەون، ئەم ڕاڤەکردنانەش شایانی گۆڕان نین. لە لایەکی دیکەوە، دەبینین موجتەهیدە شیعەکان - سەرەڕای ئەوەی وەک پێشەواکانیان دەڵێن شوێن شەریعەت و قورئان کەوتوون - دەتوانن چاکسازی لە ماناکاندا بکەن، یاخود ڕاڤەی نوێ پێشکەش بکەن، هەرچەندە بەدەگمەن ئەمە ڕوو دەدات، بەڵام ڕوودانی ڕێگری لە شیعەکان دەکات بکەونە ئەو چەقبەستنە بەرتەسکەوە، کە سوننەکان تێی کەوتوون، ئەوانەی تەنها ئیجتیهادەکان دووبارە دەکەنەوە[1].

ئەم گفتوگۆیە دەربارەی جیاوازیی نێوان شیعە و سوننە کێشەیەکمان بۆ دەخاتەڕوو، کە پێدەچێت پەیوەست بێت بە بابەتەکەمانەوە، لەبەر ئەوە، پێویستە باسی لێوە بکەین. زۆرێک لە خۆرهەڵاتناسەکان لەگەڵ سێر پێرسی کۆکن، کە شیعە لە ڕاڤەکردنیاندا بۆ دەقە پیرۆزەکان لە سوننەکان کەمتر چەقبەستوون[2]. چونکە بە شێوەیەکی گشتی ئەوان زیاتر لە سوننەکان پەیوەستن بە بیرکردنەوەی فەلسەفیی

١ السير بيرسي سايكس، *تأريخ بلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٥٤٤.

٢ د. ب. مكدونالد، بند (الإجتهاد)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٤٤٨-٤٤٩. محمد فاضل الجمالي، *العراق الجديد*: ص ٨٩.

لۆژیکی، وەک مامۆستا ئەحمەد ئەمین ڕوونی دەکاتەوە[1]. لە ڕاستیدا سوننەکان لە سەدەی دووەمی کۆچییەوە دەرگای ئیجتیهادیان داخستووە، لە کاتێکدا شیعەکان بە ڕێگەیەک لە ڕێگەکان بەکاری دەهێنن. سوننەکان لەبریی ئەمە، پرنسیپی کۆدەنگی بەکار دەهێنن، واتا هەرشتێک کۆمەڵگەی مسوڵمانان لەسەر دروستییەکەی کۆک بن، ئەوا دروستە[2]. سوننەکان بەمە پێویستیان بە عەقڵ نییە بۆ جیاکردنەوەی حەق لە ناحەق، وا دەر دەکەوێت ئەوان شوێن ڕیسایەکی بەهاداری چینە سەرەتاییەکان کەوتبن، وەک ڤیبلن دەڵێت، "ئەوەی بوونی بێتە دی حەقە[3]." لە کاتێکدا شیعەکان بڕوایان بە پێچەوانەکەی هەیە، "هەرشتێک بوونی بێتە دی، باتڵە."

پێویستە وەڵامی ئەم پرسە بدەینەوە، کە لەم ناکۆکییەی نێوان شیعە-سوننەوە دروست بووە.

وا دەر دەکەوێت ئەو مەیلە ئایدیالییانەی شیعەگەری جیا دەکەنەوە و پێشتریش باسمان لێوە کرد، بەڵگەنامەی پەیوەستییە بە بەکارهێنانی بیرکردنەوەیەکی عەقڵیی ڕووت و فەلسەفەی ڕووت. پێدەچێت هەریەک لە ئایدیالیزم و بیرکردنەوەی لۆژیکی لە یەک سەرچاوەوە بێن. بە شێوەیەکی گشتی، چینە چەوسێنراوەکان ڕوو دەکەنە نموونە باڵاکان، وەک چەکێک دژی گەورەلووتبەرزەکانیان،

---

١ أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ١٩٠. أمير علي، *روح الإسلام*: ص ٥٢٧.

٢ د. ب. مكدونالد، بند (الإجماع)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الثاني: ص ٤٤٨. ج. شاخت، بند (أصول)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ١٠٥٧.

٣ نورشتاين فيبلن، *نظرية الطبقة المرفهة*: ص ٢٠٧.

هەروەها مەیلیان لەوەیە بانگەوازەکەیان لەسەر بنەماگەلێکی غەیبی و فەلسەفی بوونیاد بنێن. چەوسێنراوەکان، ئەوانەی دەرچەیەکی گونجاویان نییە بۆ جووڵان - وەک جێرارد دێگری ڕوونی دەکاتەوە - ناچارن ڕوو بکەنە جیهانی ئایدیالی و خەیاڵ، تا قەرەبووی ئەوەیان بۆ بکاتەوە[1]. ئەوان لەبەر دڕندەیی و لووتبەرزیی چەوسێنەرەکانیان، جگە لە بوونیادنانی چەند نموونەگەلێکی باڵای خەیاڵی، چیی دیکەیان پێ ناکرێت، کە دەتوانن لە ڕێیانەوە خەمباریيان بکەن. جێرارد دێگری دەڵێت:

> ئەو تۆڵەسەندنەوە خەیاڵییەی لە ڕێی قەرەبووکردنەوەی هەستی خۆبەکەمزانی لای چینە چەوسێنراوەکان دێتە دی، لە دووبارەبەهادانانەوەی ڕیشەییەوە خۆی حەشار داوە، کە لە ڕێی وێرانکردنی بەهاکانی شکۆ و ڕێزەوە دێتە دی لای چینە هەژموونکارەکان و بەرزکردنەوەی ئامانجە ماسۆشییەکانەوە بۆ پلەیەکی بەرزتر تا جێگەی بگرێتەوە[2].

چەوسێنراوەکان کۆششێکی هزریی گەورە دەکەن لەپێناو بوونیادنانی سیستەمێکی غەیبیدا، تا بتوانن بە هۆیەوە بانگەشەکانیانی لەسەر بوونیاد بنێن، بەڕاستی ئەوان لە جیهانێکی ئایدیالیی زۆر دوور لە جیهانی واقیعیدا دەژین. لەلایەکی دیکەشەوە ستەمکارەکان ڕێوشوێنی تەواو

---

١ جیرالد دو غریە، *المجتمع و الآیدیولوجیا*: ص ٤.
٢ سەرچاوەی پێشوو.

پێچەوانە دەگرنە بەر، بەپێی تیۆرییەکەی نیتچە:

زۆر بەکەمی پیاوە بەهێزەکان هەوڵ دەدەن حەز و ئارەزووەکانیان لەپشت پەردەی ئەقڵەوە بشارنەوە، پاساویشیان بۆ ئەمە زۆر سادەیە، ئەویش "من دەمەوێت"ـە. حەز و ئارەزووش لە دەروونی کەسە بەهێز و ساغەکاندا، کە دەسەلات و سەروەرییان لە ڕادەیەکدایە، ویژدان و بەزەیی و پەشیمانی، دەرچەیەک نادۆزنەوە خۆیانی پێدا بکەن، پاساو بۆ خۆی دەهێنێتەوە و بیانووی هەیە[1].

برینتۆن لە وەسفی ئەم تەرزەدا دوورتر دەڕوات و دەڵێت:

پێویستە ئەم چینە لە پارێزگاریکردن لە خۆیدا کەمتر هێز بەکار بهێنێت، هەروەها پێویستە بەهایەکی باڵا بە هێز و داهێنانی ئەندامەکانی نەبەخشێت. تێکەڵەیەک لە باشییە سەربازییەکان، لە ڕێزگرتنی ڕێگە ڕەگداکوتاوەکانی بیرکردنەوە و ڕەفتار و حەزی ڕێککەوتن، دەکرێ نزیکبوونەوەیەکی ساکار و گونجاو بێت لە تایبەتمەندییەکانی چینی فەرمانڕەوای سەرکەوتوو[2].

ئەم وەسفە یەکێک لە فاشییەکانمان بیر دەخاتەوە کە:

... شانازی بەوەوە دەکات، کە دژی هێزە و

١ ویل دورانت، *قصة الفلسفة*: ص ٣١٦-٣١٧.

٢ كرين برينتون، *تشريح الثورات*: ص ٦٥.

> سووکایەتییش بە ڕێگە فەلسەفییە لەسەرخۆکان دەکات... پێویستی بۆ کردار، دەکەوێتە پێش پێویستی بەڵگەوە لەسەر پرنسیپەکان، پاساوهێنانەوە بۆ (پێویستی) وا دەکات بەڵگەکە ناپێویست بێت[1].

دەکرێ ئەمە ئەو هۆکارەمان بۆ ڕاڤە بکات، کە وای کردووە سوننەکان کەمتر بەلای فەلسەفەدا بچن، بە بەراورد بە شیعەکان. ئەحمەد ئەمین لەدەستدانی مەیلی ئایدیالی و فەلسەفی لەنێو سوننەکاندا، بە شێوەیەکی سەرەکی دەگێڕێتەوە بۆ فەرمانڕەوایی سارانشینە تورکەکان بەسەر ئیمپراتۆریەتی ئیسلامییەوە، هەر لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە[2]. ئەحمەد ئەمین هەوڵ دەدات بەراوردێک لەنێوان سارانشینە تورکەکان و ڕقیان بەرامبەر هەر جۆرە بیرکردنەوەیەکی ئازاد و فەلسەفی لە لایەک و فارسە شارستانییەکان لە لایەکی دیکەوە، کە ئایینەکەیان لێوانلێوە لە مشتومڕی ئازاد و داهێنان و فەلسەفە[3].

ئەم هزرە وامان لێ دەکات، لە ڕوانگەیەکی فراوانترەوە لە کێشەکە بڕوانین. ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی، بەتەنها سارانشینە تورکەکان فەرمانڕەواییان نەکردووە، بەڵکوو وەک پێشتر ڕوونمان کردەوە، سارانشینە عەرەبەکان دایان مەزراندووە و زیاتر لە سەدەیەکیش فەرمانڕەواییان کردووە. نەتەوە سارانشینەکان بە شێوەیەکی گشتی، جا

١ و. سوکس و ج. هوتس، *الأنظمة الأقتصادية المقارنة*: ص ٥٧٩-٥٨٠.

٢ أحمد أمين، *ظهر الإسلام*، المجلد الأول: ص ٤١.

٣ هەمان سەرچاوەی پێشوو: ص ٤٥.

عەرەب بن یان تورک یاخود بەربەر یان هەر نەتەوەیەکی دیکە، هەمان هەڵویستیان هەیە لەهەمبەر بیرکردنەوەی ئازاد و فەلسەفی. ئەوان لە تەرزی سەرەتایی درندەن، کە حەزیان لە هەژموونە و زیاتر ئارەزوویان لە چێژوەرگرتنە لە ململانێی مانەوە، لەبریی پەنابردنە بەر بیرکردنەوەی ئایدیالی و نوقمبوون لە خەون و خەیاڵدا.

لە ئیمپراتوریەتی ئیسلامیدا تەنها ئەو ماوەیە فەلسەفە گەشەی کردووە و لەلایەن چینی فەرمانڕەواوە پشتگیریی کراوە، کە فارسەکان لە سەرەتای فەرمانڕەوایی عەباسییەکاندا دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست. وەلێ ماوەیەکی کورت بوو و هەر کە سارانشینە تورکەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی سێیەمی کۆچیدا دەسەڵاتیان گرتە دەست، زۆر بەتوندی بەرپەرچیان دایەوە[1].

پێدەچێت ئیمپراتوریەتی ئیسلامی لە ڕێی نەتەوە سارانشینەکانەوە نەبێت، کە حەزیان لە کوشتوبڕە، بەردەوام نەبێت. گومانی تێدا نییە سارانشینەکان وەک سەرباز زۆر لە خەڵکی شارستانی ناوچە کشتوکاڵییەکان باشترن، دەکرێ ئەم ڕاستییەش ئەو سەرکەوتنە سەربازییە مەزنانە ڕاڤە بکات، کە ئیسلام دژی سوپا ڕێکخراوە مەشقپێکراوەکانی ئیمپراتوریەتە مەزنەکان بەدەستی هێناون. وەلێ کەموکورییەکی گەورەی ڕەگداکوتاو لە فەرمانڕەوایی سارانشینەکاندا هەیە لە ئیسلامدا، ئەویش ئەو سروشتی درندەیی و شاتازیبەخۆکردنەیە، کە هیچ

١ أحمد أمین، *ظهر الإسلام*، المجلد الأول: ص ٣٨ و دواتر.

جۆرێک لە جۆرەکانی ئایدیالیی ڕووت و مشتومڕی ئازادانە هەڵناگرێت.

ماکس ڤیبەر پێی وایە، سروشتی ئیسلام لە ڕێی هەژموونی چینی سەربازیی عەرەبییەوە دیاری کراوە[1]. دەشێ باشتر بێت لەژێر ڕۆشنایی ئەوەی باس کرا بڵێین، سروشتی ئیسلام بە شێوەیەکی گشتی لە ڕێی فەرمانڕەواییی سارانشینەکانەوە دیاری کراوە، لەوەشە زۆر باشتر بێت لێرەدا مانای ئیسلام تەنها بە سوننەگەری دیاری بکەین، لەسەر ئەو بنەمایەی سوننەگەری وەک بیروباوەڕی کاسۆلیکی وایە لە ئیسلامدا[2]، لە کاتێکدا شیعەگەری وەک داهێنراوی نەویستراو وایە.

دەتوانین لە کۆتاییی ئەم بەشەدا بڵێین، دوانەییی شیعە-سوننە، زۆر لەو ململانێیە دەچێت، کە نیتچە بە ململانێی (کۆیلە-گەورە) ناوی دەبات. ململانێیە لەنێوان دوو ڕەوتی دژبەیەکدا، ئەوانیش: ڕەوتی باڵایی و ڕێزگرتن و واقیعگەری، دژی ڕەوتی ملکەچی و کەساسی و ئایدیالی. لایەنی یەکەم زیاتر بایەخ بە دامەزراندنی دەوڵەت دەدات، لە کاتێکدا لایەنەکەی دیکە بایەخ بە دامەزراندنی ئایین دەدات. لە ڕاستیدا گرفتەکە لەوەدایە، ئیسلام دەوڵەت و ئایینە لە یەک کاتدا. کەواتە هیچکام لەم دوو لایەنە لەوی دیکەیان نزیکتر نییە لە ڕۆحی ئیسلامەوە. پێدەچێت ناکۆکیی نێوانیان لەو گۆشەنیگایەدا بێت، کە هەریەکەیان هەوڵ دەدات لە

1 ریتشارد نیبور، *الأصول الإجتماعية للطائفية*: ص ٧٧-٧٨.
2 أ. ج. ونسيک، بند (السنة)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ٥٥٥.

ڕێیەوە لە ئیسلام بڕوانێت. یەکەمیان لە گۆشەنیگایەکی سیاسییەوە سەیری ئیسلام دەکات، لە کاتێکدا لایەنەکەی دیکە لە گۆشەنیگایەکی ئایینیی ڕووتەوە لێی دەڕوانێت. لە ئەنجامیشدا، ئیسلام لە هەردوو لایەنەکەوە دوورە و هەردوو گرووپەکەش دوولایەنە سەرەکییەکەی گرفتەکەن.

بە بۆچوونی ئێمە، ناتوانین لە شیعەگەری بەتایبەت و گرفتی ئیسلام بەگشتی تێبگەین، تاوەکوو بە شێوەیەکی تەواوەتی لە کەسێتیی ناوازەی عەلی تێنەگەین. زۆرێک لە نووسەرە عەرەبە هاوچەرخەکان وای دەبینن، ئەوەی یەکەمین دەستەی شیعەکان لەدەوری کۆ بوونەوە، ئەو باوەڕە پتەوەیان بوو کە عەلی شایانی ئەوە بوو دوای پێغەمبەر خیلافەت وەر بگرێت[1]. لە ڕاستیدا دەکرێ عەلی بە تۆوی شیعەگەریی ئەمڕۆ هەژمار بکەین. ئەو پێشەوای گەورە و پیرۆز و مەزنیانە، تەنانەت لای هەندێکیان، نیوەی مرۆڤە و نیوەکەی دیکەی خوداییە[2].

دەشێ لێرەدا کەسێک بپرسێت: ئەو تایبەتمەندییانەی عەلی چی بوون، کە وایان کرد ببێتە هۆی سەرهەڵدانی ئەم دیاردەیە؟ ئایا ئەویش بەربژێرێک نەبوو وەک بەربژێرەکانی دیکە بۆ خیلافەت، کە کێبەرکێیان لەسەر دەسەڵات، مێژووی

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ٢٧٧-٢٧٨. محمد عبدالله عنان، *تأريخ الجمعيات السرية*: ص ٣٦، کە (محمد الزين لە کتێبی *الشيعة في التأريخ*: ص ١٧ و دواتر)دا لێوەی وەرگرتووە. ل. د. ڤیدا، بند (الأمويين)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الرابع: ص ٩٩٩. يحيى أبو يوسف، *كتاب الخوارج*: ص ٥٠ و دواتر.

٢ س. هيورات، بند (علي)، *موسوعة الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢٨٤-٢٨٥.

ئیسلامی لێوانلێو کردووە لە جەنگی نێوخۆیی، یاخود ئەو جیاواز بووە لەوان؟

بە بۆچوونی ئێمە، ئەو لە زۆر تایبەتمەندییە کەسییەکانیدا، کەسێکی ناوازە بووە. لەو باوەڕەداین گرفتی ئیسلام ئەم کەسایەتییە ناوازەیەی گەیاندە یەکێک لە بەرزترین ترۆپکەکانی، خۆ ئەگەر لە هەمووشیان بەرزتر نەبووبێت.

ناتوانین لە ڕێی چیرۆکێکی باشترەوە لە چیرۆکی ژیانی عەلی، کێشەی نێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزم وێنا بکەین. دەسەڵاتەکانی ئیمپراتۆریەتێکی بەرفراوان درانە دەست مەزنترین ئایدیالیست، کە باکی بە ڕێسا سوودگەراکان یان پێویستی و چارەسەرە ناوەندییەکان نەبوو، ئەو نموونەی باڵای ئیسلام و تاکە ڕێنیشاندەری بوو، لە کاتێکدا کۆمەڵگەی مسوڵمانان لەو سەردەمەدا تەواو لەو ئایدیاڵانەوە دوور بوون. سایکس وەسفی عەلی دەکات و دەڵێت:

> عەلی کەسێکی دیار بوو، چونکە ئەو خەلیفەیەکی خانەدانی مەزن و خۆڕاگرێکی بڵند بوو، کە چواردەورەکەی نەیاندەتوانی قبوڵی بکەن، ئەو ڕازی نەبوو ڕێساگەلێکی سوودگەرا بەڕێوەی بەرن، بەمەش، هاوکوفی نەیارە فێڵباز و تەڵەکەبازەکەی (معاویە)[1] نەبوو، کە ئامادە بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی، بۆ نزمترین ئاست دابەزێت و هەموو ڕێگەیەکی تاوانکارییش بگرێتە

[1] پێویستە لێرەدا ئەوەمان لەبیر بێت، معاوییە کە سەرکردایەتیی نەیارانی عەلیی دەکرد، کوڕی سەرکردەیەکی قورەیشی بوو بە ناوی (ئەبو سوفیان)، کە پێشتر سەرکردایەتیی نەیارانی محەمەدی کردبوو، هەریەک لە کوڕ و باوک، دوای فەتحی مەککە، مسوڵمان بوون.

بەر... پێداگریی توندی عەلی لەسەر پاکێتیی، وای کرد لەنێو ئەو عەرەبە چاوچنۆکانەدا خۆشەویست نەبێت، کە خێروبێری ئیمپراتۆرییەتەکەیان بەتاڵان دەبرد. وەلێ هاوشان لەگەڵ پاکێتیی تەواوی و پابەندبوونی بە نموونە باڵاکانەوە، کەسێکی سادە و ناکارباشیش بوو، ئەمانە وایان کرد ببێتە درەوشاوەترین کەس[1].

ئەگەر بمانەوێت وێنەیەکی تەواوی ئەو گرفتە بخەینە ڕوو کە لە سەردەمی خیلافەتی عەلیدا گەیشتە ترۆپک، دەبێت بگەڕێینەوە سەرەتای چیرۆکەکە، واتا بۆ ئەو کاتەی پێغەمبەر دوای کۆچ، سروشتی ئیسلامی گۆڕی بۆ سیستمێکی سیاسی-ئایینی.

وەک پێشتر باسمان کرد، پێویست بوو پێشبینیی دەرکەوتنی گرفتەکە بکەین، لەو کاتەدا کە نەدەکرا نموونە باڵاکانی ئایین، بەبێ ناکۆکی یان دژیەکییەک، لە بەرژەوەندییەکانی دەوڵەت نزیک بینەوە. پێدەچێت ئەمە ئەو فاکتەرە بێت، کە دوای کۆچ بووە هۆی زۆر گۆڕانکاری لە تەشریعاتەکانی پێغەمبەردا. چەمکگەلی ناسیخ و مەنسوخ لە مەدینەدا برەویان پەیدا کرد[2].

دەکرێ دەرکەوتنی ناسیخ و مەنسوخ ئاماژەبن بۆ شێوازی پێغەمبەر، کە توانیی لە ڕێیەوە ئایدیالی و واقیعی لەگەڵ یەکدیدا کۆ بکاتەوە. لەوانەیە دروست بێت بڵێین، گرفتەکە ئەو کاتە سەری هەڵدا، چونکە محەمەد پێغەمبەر

---

١ السير بيرسي سايكس، *تاريخ بلاد فارس*: ص ٥٢٥.

٢ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ٢٢١ و دواتر.

و فەرمانڕەوا بوو لە یەک کاتدا، یاخود بە واتایەکی دیکە، دۆزەرەوەی ئایدیالی و نوێنەری واقیعیەت بوو.

سەرباری ئەمەش، هیچ بەرژەوەندییەکی دونیایی نەبوو تا نموونە باڵاکانی ئایین بشێوێنێت. لە ڕاستیدا محەمەد بایەخی بە بژاوتە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکەی دەدا، لەمەشدا ئەو مسوڵمانانەی لە سەرەتاوە باوەڕیان بە ئیسلامدا کردبوو، هاوکارییان دەکرد بۆ مەبەستگەلێکی ئایینیی ڕووت. دەشێ ئەوان بە هەڵچوونە ئایینییەکانیانەوە سەرقاڵ بووبن، بە پلەیەک، تا ڕادەیەک بەرژەوەندییە دونیاییەکانیان لەبیر کردبێت، دەشکرێ بە هۆی کاریگەری و ڕێنماییەکانی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیانەوە، بەرژەوەندییە دونیاییەکانیان بە شێوەیەکی کاتی خستبێتە لاوە.

دەکرێ هەمان شت بە پلەیەکی کەمتر لە سەردەمی ئەو خەلیفانەدا، کە دوای پێغەمبەر هاتن، ڕاست بێت. بە هەرحاڵ، هەندێک لە خۆرهەڵاتناسانی وەک ڤیدا، لامنس و کیتانی، پێیان وایە تەنانەت هەردوو خەلیفەی یەکەم و دووەمیش لە نموونە باڵاکانی ئیسلام دوور بووبن، بەڵام کەسایەتییە بەرێزەکەیان ڕێگر بووە لەوەی مسوڵمانان ئەو هاودژییەی لەنێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزمدا هەبووە، ببینن. ئەو خۆرهەڵاتناسانە پێیان وایە هاودژییەکە لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم (عوسمان)دا سەری هەڵداوە[1].

بڕوامان وایە یەکەمین هەنگاو، کە بووە هۆی دەرکەوتنی گرفتی ئیسلام، کەمێک پێش ئەوە ڕووی داوە، واتا لە سەردەمی خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا. لە سەردەمی

---

١ ل. د. فیدا، بند (الأمويين)، موسوعة الإسلام، المجلد الرابع: ص ٩٩٩.

خەلیفە عومەری کوڕی خەتابدا تالانییەکی زۆر ڕژایە مەدینەوە، بە هۆی فتوحاتی ئیسلامی ناوچەی (کەوانەی بەپیت)[1] و میسر و وڵاتی فارسەوە. هەریەک لە پێغەمبەر و خەلیفەی یەکەم، دەستکەوتەکانی دەوڵەتیان بە شێوەیەکی یەکسان بەسەر مسوڵماناندا دابەش دەکرد، بەڵام عومەر لە دابەشکردنی دەسکەوتەکاندا نادادپەروەر بووە، بەپێی چاکەخوازی و زوو هاتنە نێو ئیسلامەوە بەشەکانیانی دیاری دەکرد[2].

خەلیفە عومەر پاساوی بۆ ئەم دابەشکردنە نادادپەروەرانەیە ئەوە بوو، کە ناکرێ ئەوەی لەگەڵ پێغەمبەردا شەڕی کردووە، یەکسان بێت لەگەڵ ئەوەدا کە دژی پێغەمبەر جەنگاوە[3]. دەکرێ ئەمە تەنها مامەڵەکردنێکی بەباشتردانان بێت، وەلێ مەترسییەکە لەو ڕاستییەدایە، کە ئایدیالی و خۆشگوزەرانیی ماددی لەگەڵ یەکدیدا ناڕۆن بەڕێوە، وەک پێشتر باسمان کرد، ئایدیالیزم زیاتر مەیلی بەلای ئەوەدایە ببێتە تایبەتمەندییەک لە تایبەتمەندییەکانی کەسانی بەشخوراو و چینە چەوسێنراوەکان. هەر کە ئەم چینانە پێگەیان بەرزتر بۆوە و چەوساندنەوەیان لەسەر لا چوو، دەبینین لەهەمبەر نموونە باڵاکانی پێشوویان، هەڵویستێکی تەواو جیاوازیان دەبێت.

---

١ کەوانەی بەپیت (الهلال الخصیب): ئەم زاراوەیە لەلایەن شوێنەوارناسی ئەمەریکی (جەیمس هنری برستد)ەوە داهێنراوە، مەبەست لێی، دەشتەکانی ڕووباری دیجلە و وڵاتانی شامە، کە وڵاتانی عێراق، سوریا، ئەردەن، فەلەستین و لوبنان دەگرێتەوە، ئەم ناوچەیەش پێگەیەکی ستراتیژیی گرنگی هەیە، چونکە هەرسێ کیشوەری ئاسیا، ئەورووپا و ئەفەریقا بەیەکەوە دەبەستێتەوە. (و. ک.)

٢ یحیی أبو یوسف، *کتاب الخراج*، ص ٥٠ و دواتر.

٣ هەمان سەرچاوە.

پێدەچێت بەنگر لەمیانەی تاوتوێکردنی گرفتی ئاییندا، کە خۆی لە ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزمدا دەبینێتەوە، هەمان بۆچوونی هەبێت[1]. بەنگر ئاماژە بەوە دەکات، خەڵکی ئایدیالیست، ئەوانەی دەستیان بە بەها ئایینییە ئایدیالییەکانەوە گرتووە، بەپێداگرییەوە تێوەگلان لە کاروبارە دونیاییەکانەوە ڕەتدەکەنەوە، ئەوان:

> لە تەواوی دەستەکانی دیکەی کۆمەڵگە جیاوک[2]یان کەمترە... پاشانیش لە جیهان پاشەکشە دەکەن. ئەوان پێیان وایە دەکرێ لە ڕێی ئازادبوون لە کاریگەرییەکانی هێزە دونیاییەکانەوە، بەردەوامی بە هێزە ئایینییەکان بدرێت، بەمەش خۆیان لە دەستەیەکی ئایینی رووتدا کۆ دەکەنەوە[3].

بە بۆچوونی بەنگر، هەندێک لەو کەسانەی تێڕوانینێکی ڕەشبینانەیان هەیە بۆ کۆمەڵگە، بڕوایان وایە "چەندین خراپەکاری ڕەگداکوتاو لە کۆمەڵگەدا هەن، پێویستە مرۆڤ لەگەڵیدا ڕێک نەکەوێت[4]." بەڵام دەستە ریالیستەکان، نموونە باڵاکانیان لەگەڵ بەرژەوەندییە دونیاییە باوەکاندا دەگونجێن، ئەوان:

> لە دابەشکردنی سامان و دەسەڵاتدا بەسەر کۆمەڵگەکانیاندا، تا ڕادەیەک سەرکەوتوو بوون، لەبەر ئەوە، پێیان وایە لە هەموو حاڵەتێکدا

---

١ میلتون ینغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: بەشی دووەم و دواتر.
٢ جیاوک: إمتیاز (و. ک.)
٣ هەمان سەرچاوە.
٤ میلتون ینغر، *الدین فی الصراع علی السلطة*: بەشی دووەم و دواتر.

سازان یەکلاییکەرەوە بێت، چونکە ئەم دەستانە بە شێوەیەکی سروشتی باوەڕیان بەوەیە، ئەو کۆمەڵگەیەی زۆر بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا دەکات، خراپەکاریی ڕەگداکوتاوی تێدا نییە[1].

وای دەبینین ئەو تووە کۆمەڵایەتییەی لێیەوە گرفتی ئیسلام گەشەی کرد، لێرەدا خۆی مەڵاس داوە، ئەو گرفتە لە ئەنجامی ئەو تالانییە زۆرانەوە سەری هەڵدا، کە گیرفانی باوەڕدارەکانی پڕ کرد و لە ئەنجامیشدا گۆڕینی بۆ دەستەگەلێکی گەشەکردووی ڕوو لە سازان، لەبریی هەڵسوکەوتکردن بە شێوەیەکی ئایدیالی.

پێدەچێت خودی عومەری کوڕی خەتاب خۆیشی درکی بە ئاکامە کۆمەڵایەتییەکانی ئەو دەوڵەمەندبوونەی بەسەر باوەڕدارانیدا هات، کردبێت، کاتێک ئەو تالانییە زۆرەی بینی کە لە ئەنجامی فەتحکردنی وڵاتانی فارسەوە هێنابوویان، دەستی کردە گریان و بە یەکێک لە هاوڕێ نزیکەکانی خۆی وت: "خودا هەرگیز ئەمە بە گەلێک نادات، بێ بڵاوکردنەوەی دوژمنکاری لەنێویاندا[2]."

هەنگاوی دووەم، کە بووە هۆی دەرکەوتنی گرفتەکە، لە سەردەمی خەلیفەی سێیەم عوسمانی کوڕی عەفاندا ڕووی دا. ئارسەر گیلمان لەبارەیەوە دەڵێت:

> ... کەسێتییەکەی لەچاو پێشتریدا گۆڕانکاریی بەسەردا هات: هۆگری سەروەت و سامان بوو... لاواز بوو؛ کەسوکارەکەی خۆش دەویست،

[1] هەمان سەرچاوە.

[2] یحیى أبو یوسف، *کتاب الخراج*، ص ٥٦.

سەرەڕای ئەوەی ئەو کەسوکارەی لە خۆی نزیکی خستنەوە، دوژمنی سەرسەختی ئیسلام بوون، توانای ئەوەشی نەبوو هاوسۆزیی ژێردەستەکانی دەستەبەر بکات و بۆ یەکێتیی نێوانیان هانیان بدات[1].

عوسمان لە دابەشکردنی تالانییەکانی جەنگدا ئەو کەسانەی لەگەڵ پێغەمبەردا جەنگابوون‌پشتگوێ خست و ئەو کەسانەی لە دژی پێغەمبەر جەنگابوون، خستە پێشیانەوە، ئەوانیش ئومەوییەکان بوون، تەنها لەبەر ئەوەی کەسی نزیکی خۆی بوون. بە هۆی ئەمەشەوە، دۆخێکی مەترسیدا سەری هەڵدا، دەستەی یەکەم بێدەنگ نەبوون و کەوتنە بزواندنی ڕای گشتی دژی خەلیفە، بانگەشەی ئەوەیان دەکرد، کە لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ناڕوات. ژمارەیەک لە هاوەڵانی پێشین، پەیامیان بۆ تەواوی ناوچەکانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی نارد، تیایدا هاتبوو: "ئەگەر جیهادتان دەوێت، ئامادە بن، چونکە ئاینی محەمەد لەلایەن خەلیفەکانەوە تێک دراوە[2]."

لە کۆتاییدا خەڵکی دژی نادادپەروەیی خەلیفە کرد بوونەوە و دەوری ماڵی خەلیفەیان دا و کوشتیان، بەڵام بەرئەنجامەکەی بەو باشییە نەبوو، کە هاوەڵان پێشبینییان دەکرد، ئەو خەلیفەیەی خەڵکەکە هەڵیان بژارد، جیاواز بوو لە عوسمان و عومەریش، دەستکەوتەکانی دەوڵەتی بەیەکسانی

---

١ أ. غیلمان، (*The Saracens*) [مسولمانەکان فەتحیانکرد]: ص ٢٦٦.

٢ إبن الأثیر، *الكامل في التأریخ*، المجلد الثالث: ص ٦٥. کە (محمد الزین، *الشیعة في التأریخ*: ص ١٠٥) لێوەی وەر گرتووە.

بەسەر مسوڵماناندا دابەش کرد، چونکە لە ڕوانگەی ئەوەوە، هەمووان یەکسان بوون، نەک بەپێی زوو هاتنەنێو ئیسلامەوە یان بەپێی خواستە کەسییەکانی خۆیەوە.

لە کۆتاییدا هاوەڵان درکیان بەوە کرد، هەڵەیەکی گەورەیان کردووە، هەر بۆیە خەڵکیان هان دا بۆ کوشتنی ئەو خەلیفەیەی ڕقیان لێی بوو، بەڵام ڕێنماییان نەکردن بۆ هەڵبژاردنی خەلیفەیەکی خۆشەویست. هێزێکیان بەدی کرد، کە ناتوانن کۆنترۆڵی بکەن، پێدەچێت ئەمە ڕەوتی تەواوی شۆڕشەکان بێت، شۆڕشەکان هەمیشە بە هۆی کاریگەریی دەستەیەکی خاوەن جیاوکەوە دژی دەستەیەکی دیکە، سەرهەڵدەدات، بەڵام هەر کە دەستە هەژارەکان درکیان بە بوونی ستەم کرد، لە کۆتاییدا دژی هەردوو دەستە خاوەن جیاوکەکە دەجەنگەن. وەک پێشتر باسمان کرد، شتەکە تەنها پرسی بوونی ئەو ستەمە نەبووە، کە بووەتە هۆی بێزاربوونی چینە چەوسێنراوەکان، بەڵام بڵاوبوونەوەی ئەو بیروباوەڕەی ئەوان ستەملێکراون، دەبێتە هۆی بێزارییان، هەر ئەمەش لە سەردەمی عوسماندا ڕووی دا، هەر بۆیە جەماوەر نە تەنها دژی خەلیفە و کەسوکارە تازە دەولەمەندبووەکەی، بەڵکوو دژی هەر جۆرە مامەڵەیەکی پەسەندکاری ڕاپەڕین.

بۆیە خەڵکەکە عەلییان وەک خەلیفەی نوێ هەڵبژارد، چونکە لە ڕوانگەی ئەوانەوە، تاکە کەس بوو سیمبول بێت بۆ نموونە باڵاکانی ئیسلام؛ واتا بۆ یەکسانی و برایەتیی تەواوی مسوڵمانان.

لەوانەیە زێدەڕۆیی بکەین ئەگەر بڵێین، خەونی ئایدیالیی

ئەفلاتوون بۆ فەرمانڕەوایی فەیلەسووف، ئەو کاتەی عەلی بۆ خیلافەتی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی هەڵبژێردرا، هاتە دی، ئەوە نەبێت عەلی بەتەواوەتی شکستی هێنا، هەر وەک چۆن ئەفلاتوونیش سەردەمانێک پێشتر شکستی هێنابوو، کاتێک سیراکیۆسی ستەمکار داوای لێ کردبوو دەوڵەتەکەی لەسەر بنەما ئایدیالییەکانی دابمەزرێنێت. نیکۆلسن لەو بارەیەوە دەڵێت:

> عەلی تەواوی تایبەتمەندییەکانی تێدا بوو، تەنها تایبەتمەندیی فەرمەنڕەوا نەبێت؛ زیندوویتی، بڕیاردان، تێڕوانین و سەرنجدان. جەنگاوەرێکی جوامێر و ڕاوێژکارێکی دانا و هاوڕێیەکی بەوەفا و نەیارێکی دلێر بوو. لە شیعر و زمانپاراویدا سەرکەوتوو بوو، شیعر و وتەکانی لەنێو تەواوی خەڵکی خۆرهەڵاتی دەوڵەتی ئیسلامیدا بڵاو ببوونەوە، هەرچەندە هەندێکیان ڕاست نین و هەڵبەستراون. سەرباری ئەوەی خاوەن ڕۆحێکی ناسک بوو، بەڵام خاوەن ئەو لێهاتووییە نەبوو، کە واقیعی سەرکردایەتی دەیخواست، هەر بۆیە نەیارەکانی، کە خاوەن هیچ پرنسیپ و باشەیەک نەبوون، بەسەریدا سەر کەوتن، دەوتری "جەنگ هونەری فێڵوتەڵەکەیە." هەر بۆیە شکستی خوارد[1].

**بە ڕای ئێمە، عەلی بە هۆی نەبوونی تێڕوانین و بڕیاردانەوە شکستی نەهێنا، وەک نیکۆلسن دەڵێت، بەڵکوو بە هۆی ئایدیالیبوونی لە ڕادەبەدەریەوە شکستی هێنا.**

---

١ رینولد نیکولسن، *تاریخ الأدب العربي*، ص ١٩١.

وەک فۆن وایس ڕوونی دەکاتەوە، دوو جۆر بەها ناتوانرێ لەگەڵ یەکدیدا کۆ بکرێنەوە؛ بەهایەکی دیاریکراو لە جۆرێکی تایبەت، ناتوانرێ درکی پێ بکرێت بە لەناوچوونی بەهایەکی دیکە نەبێت لە جۆرێکی دیکە[1]. لەبەر ئەوە، پێویست بوو عەلی یا دەست بە بەها ئایینییەکانەوە بگرێت، کە هیچکەس گومانی لە دڵسۆزی عەلی بەرامبەر ئەو بەهایانە و دژایەتیکردنی ئەو دەستانەی بەدوای بەرژەوەندیدا وێڵ بوون، نەبوو، یا ئەوەتا بایەخ بە دەسەڵاتی بدات و قوربانی بەو بەهایانە بدات، وەک جۆرج سول دەڵێت، "هەموو کەسێک دەسەڵات دەکاتە پێوەری سەرەکیی کارکردنی و بەهاکانی دیکە دەخاتە مەترسیی لەدەستدانەوە[2]."

ئیبن خەلدوون دەڵێت:

پیاوێک لە عەلیی پرسی: بۆچی مسوڵمانان لەهەمبەر تۆ ناکۆک بوون و لەهەمبەر ئەبوبەکر و عومەر ناکۆک نەبوون؟ لە وەڵامدا دەڵێت، چونکە ئەبوبەکر و عومەر والیی کەسانێکی هاوشێوەی من بوون، کەچی من والیی کەسانێکی هاوشێوەی تۆم[3].

ئیبن خەلدوون هەوڵ دەدات بەپێی تیۆرییە کۆمەڵایەتییەکەی تایبەت بە دەمارگیری یاخود ڕۆحی خێڵەکی، واتای قسەکەی عەلی ڕاڤە بکات. بە ڕای ئیبن خەلدوون، لە سەردەمی هەردوو خەلیفە ئەبوبەکر و عومەردا، دەمارگیری کاریگەرییەکی گەورەی نەبووە، مسوڵمانان هەر لەژێر کاریگەریی پەرجووە

---

١ فۆن وایس-هاورد بیکر، *علم الإجتماع المنهجي*: ص ٦١٧.

٢ *الجمهورية الجديدة*، العدد ١٠٩، ٦ ئەیلولی ١٩٤٢: ص ٣٢٧، کە لە (میلتون ینغر، *الدین في الصراع علی السلطة*: ص ٢٣٠)ەوە وەر گیراوە.

٣ إبن خلدون، *المقدمة*.

نائاساییەکانی ژیانی پێغەمبەردا بوون "لەو بارودۆخانەی بە چاوی خۆیان دەیانبینی، وەک ئامادەبوونی فریشتەکان لە سەرکەوتنیاندا و دەماودەمکردنی هەواڵی ئاسمان لەنێویاندا[1]."

بەڵام –ئیبن خەلدوون دەڵێت - پلەبەپلە خەڵکی گەڕانەوە سەر خووە کۆنەکانیان و دەمارگیرییەکەیان و نموونە باڵا ئاینییەکانیان لەبیر کردن، خەڵکی پەرجووەکانی پێغەمبەریان لەیاد کرد و ویژدانی ئاینیش هیچ بەهایەکی نەما[2].

ئەم بۆچوونەی ئیبن خەلدوون، بەدڵنیاییەوە نوێنەرایەتیی تێڕوانینی سارانشینەکان دەکات دەربارەی ئەم پرسە مشتومڕئامێزە. ئیبن خەلدوون لە تەواوی بەشەکانی *المقدمة* دا هەڵوێستێکی پۆزەتیڤی هەیە بەرامبەر معاویە، هەوڵیش دەدات بە شێوەیەک لە شێوەکان لەبریی ئەو پۆزش بهێنێتەوە. ئیبن خەلدوون وای دەبینێت، معاویە لەبەر بەرژەوەندیی دونیایی، یاخود لەبەر بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی، عەلیی نەکوشتووە. ئەوەی پاڵنەری بوو، دەمارگیریی خێڵەکەی و کۆبوونەوەی ئەو خێڵانە بوو، کە پشتگیریان دەکرد و نەیشیتوانی لەبەرامبەریاندا خۆی ڕابگرێت. خۆ ئەگەر وەڵامی پاڵنەری دەمارگیرییەکەی خۆی نەدابایەوە، ئەوا سەرکردەیەکی دیکە شوێنی دەگرتەوە، لەوەش بوو ئەمە کاریگەرییەکی نێگەتیڤی هەبێت بۆ داهاتووی ئیسلام. ببینە چۆن خیلافەت لە سەردەمی پێغەمبەردا گرنگ نەبوو، پاشان لە سەردەمی خیلافەتدا کەمێک بایەخی زیادی کردووە، بەپێی پێویستی بۆ پاراستن و جیهاد و فتوحاتەکانەوە، ئەوان سەرپشک بوون

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو: ص ٢١٣.

٢ إبن خلدون، *المقدمة*.

لە کردن یان جێهێشتنی خیلافەتدا، وەک باسی عومەرمان کرد، لە ئەمڕۆشدا بووە بە یەکێک لە گرنگترین کاروبارەکان بۆ پاراستن و هەڵسان بە بەرژەوەندییەکان و دەمارگیرییش تیایدا، کە نهێنیی وابەستەبوون و بێهیوایی و سەرچاوەی کۆدەنگی و ڕێککەوتنە، دەستەبەری مەبەستە شەرعییەکان و ڕێساکان دەکات[1].

سەرباری لایەنگرییەکەی، ئیبن خەلدوون ئەو فاکتەرەمان بۆ دەخاتە ڕوو، کە لە مێژووی کۆمەڵایەتیی ئیسلامدا و لە سەردەمی خیلافەتی عەلی و دواتردا، ڕۆڵی سەرەکیی گێڕاوە.

ئەحمەد ئەمین لەوەدا لەگەڵ ئیبن ئەبی حەدیددا کۆکە، کە یەکێک لە گرنگترین فاکتەرەکانی شکستی عەلی ڕاستییەکدا خۆی دەبینێتەوە، ئەویش بەیەکسانی مامەڵەکردنیەتی لەگەڵ تەواوی خەڵکیدا "عەلی کوڕی ئەبی تالیب، خانەدانێکی نەدەخستە پێش ژێردەستەیەکەوە، عەرەبێکیشی نەدەخستە پێش عەجەمێکەوە، چاکەشی لەگەڵ سەرکردە و سەرۆک خێڵەکاندا نەدەکرد. بەدڵنیاییەوە ئەمە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی عەرەبەکان لێی یاخی ببن؟"[2]

وەلێ معاوییە تەواو پێچەوانەی عەلی بوو. ئۆزبۆرن دەڵێت، معاویە دوودڵ نەبوو لەوەی هەر ڕێگەیەک بگرێتە بەر، کە پێی وا بوویێت سوودبەخشە بۆ گەیشتن بە مەبەستە سەرەکییەکەی، ئەویش خیلافەتە[3].

---

١ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٣٧٧، چاپی (مكتبة دار الكتاب اللبناني).
٢ إبن أبي الحديد، *شرح النهج*، المجلد الأول، المقدمة: ص ١٨٠، کە (أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، المجلد الأول: ص ٢٢) لێوەی وەر گرتووە.
٣ أمير علي، *روح الإسلام*: ص ٤٤٠، سەیری (السير بيرسي سايكس، *تاريخ بلاد فارس*: ص ٥٢٥.) بکە.

هەندێک لە هاوەڵانی عەلی ئامۆژگارییان دەکرد ئەوە بکات، کە معاویە دەیکات، بەڵام ئەو بەردەوام ئەمەی ڕەت دەکردەوە و دەیوت: "ئایا فەرمانم پێ دەکەن لە ڕێی ستەمەوە داوای سەرکەوتن بکەم؟[1]" هیورات دەڵێت:

عەلی زۆر خواپەرست بوو و ئارەزووەکانی خۆی کوشتووە، دەبینین بەردێک دەبەستێت بە سکیەوە، تا لە ئازاری برسێتی ڕزگاری ببێت، لە کاتێکدا هەموو ئەوەی هەیبووە، بەخشیویەتی. هیچکات دونیا لە خشتەی نەبردووە و هەمیشەش دەیوت: "دونیا لاشەیەکی بۆگەنە و ئەوانەشی داوای دەکەن، سەگن، ئەوەی ئەو لاشە بۆگەنەی دەوێت، دەبێ ئامادە بێت لەگەڵ سەگەلدا تێکەڵ ببێت." دەشیوت: "کامەرانی و خۆشبەختی بۆ ئەوانەی دونیا جێ دەهێڵن و هەوڵ بۆ دوارۆژ دەدەن." کاتێکیش مرد، دوای خۆی جگە لە ٦٠٠ درهەم، چیی دیکەی جێ نەهێشت[2].

دەشێ ڕاست بێت ئەگەر لێرەدا بگەینە ئەو دەرئەنجامەی ململانێی نێوان عەلی و معاویە دەرخەری ئەو ململانێیەیە، کە لەنێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزمدا هەیە لە ئیسلامدا. لە ڕاستیدا ئەو یەکگرتنە کاتییەی لە سەردەمی پێغەمبەر و خەلیفەکانی یەکەمدا لەنێوان ڕیالیزم و ئایدیالیزمدا هاتە دی، هەنووکە ئەستەم بووە. ئەوەی خەلیفەی دووەم لێی دەترسا بە هۆی

---

١ إبن أبي الحديد، شرح//نهج، المجلد الأول: ص ١٨٢، کە (أحمد أمين، ضحی//الإسلام، المجلد الأول: ص ٢٣-٢٤) لێوەی وەر گرتووە.

٢ س. هیورات، بند (علي)، موسوعة //الإسلام، المجلد الإول: ص ٢٨٤-٢٨٥.

ئەو سامانەی کەوتە دەست باوەڕدارانەوە، لە کۆتاییدا ڕووی دا، هەر دەبوو ململانێی لەنێوان ستەمکار و ستەملێکراو و هەژار و دەوڵەمەندەکاندا، زوو بێت یان درەنگ، سەر هەڵبدات.

خیلافەتی عەلی، خاڵی وەرچەرخان بوو لە مێژووی ئیسلامدا. لێرەدا نموونە باڵا ئاینییەکان لە شێوەی پێکهاتەی ئاشکرادا، لە دژی بەرژەوەندییە دونیاییەکان وەستانەوە. یەکێک لە چیرۆکە بەناوبانگەکانی نێو مسوڵمانان، کە پەیوەستە بە جەنگی نێوان عەلی و معاویەوە، ئەوەیە کاتێک داوا لە کەسێکی بێلایەن و سەیرکەر دەکرێت بچێتە پاڵ یەکێک لە لایەنەکان، لە وەڵامدا دەڵێت:

نوێژکردن لە پشت عەلییەوە تەواوترینە
خواردنیش لەگەڵ معاویەدا چەورترینە
وەستانیش لەسەر ئەم گردە سەلامەتترینە

ئەم چیرۆکە سەرباری ئەوەی گومان لە دروستییەکەی دەکرێت، وێنەیەکمان لەو دۆخە پێ دەبەخشێت، کە ئەوکات دەگوزەرا، وێنەیەکی ڕوونتر لە هەر زانیارییەکی مێژوویی دروست.

بەراستی قورسە سەرکردەیەک بتوانێت لە یەک کاتدا نوێژێکی ڕاستەقینە و خواردنێکی خۆش بە شوێنکەوتووەکانی ببەخشێت. فۆن وایس دەڵێت:

پێویستە کلیسا، تەرزێکی فرەیی هەبێت، کە خزمەت بە ئامانجە کۆمەڵایەتییەکان بکات، یاخود پێگەیەکی هەبێت تیایدا خواپەرستی بکرێت، یان هەوڵێک بێت بۆ ناچارکردنی نەواتی دیکە، تا کەشە بە چەند هەڵوێستێکی دیاریکراو بدەن و پاشانیش

> هەموویان یەکسانن لە یەکەی بیروباوەڕ و ڕەفتاردا، یاخود ئاراستەکردنی ماندوو و هیلاکەکان بەرەو ڕێگەی دەربازبوون لە باری قورسی فەنابوون[١].

ئەو دووانەییەی مەسیحیەت ئەم دونیایەیان پێ لە ڕۆژی دوایی جودا دەکاتەوە، تا هەنووکەش تا ڕاددەیەک ڕاستن. مرۆڤ ناتوانێت لە یەک کاتدا هەردوو کارەکە بەرێتەوە. محەمەدیش بە هەمان هزر ئاشنا بووە کاتێک لە مەککە بانگەشەی دەکرد... (مَا وَدَّعَكَ رَبُّكَ وَمَا قَلَىٰ ۝ وَلَلْآخِرَةُ خَيْرٌ لَّكَ مِنَ الْأُولَىٰ)[٢] واتا: (پەروەردگارت دەستبەرداری تۆ نەبووە و وازی لە تۆ نەهێناوە و خەشمی لێ نەگرتوویت ۝ بێگومان قیامەت و دوارۆژ بۆ تۆ لە دونیا چاکترە)[٣].

ڕاستە عەلی ئەم دونیایەی دۆڕاند، وەلێ ئەگەر سەرنج لە پرسەکە بدەین، دەبینین سەرکەوتنێکی مەزنی بەدەست هێناوە. نیکۆلسن دەڵێت:

> دوای تێپەڕینی سەدەیەک بەسەر مردنیدا، خەلکی وەک خەلیفەی پێغەمبەر هەژماری دەکەن، بە دەقی خوداییەوە، شەهیدێکی پیرۆز، بێتاوانێکی پاک، تەنانەت هەندێک بە بەرجەستەکەری خواوەندی دەزانن. عەلی کە ئەفسانەی شیعەکانە، کەسایەتییەکی مێژوویی ڕێزلێنراو نییە، بەڵکوو بە شێوەیەکی ئەفسانەیی سیمبولی تێگەیشتنە ئایینییەکانە و ئامانجە سیاسییەکانی توێژێکی

١ ڤون وایس-هاورد بیکر، *علم الاجتماع المنهجي*: ص ٦١٧.

٢ سورة الضحى: الآيتان ٣-٤.

٣ بورهان محمد امین، *تەفسیری ئاسان*، سەرچاوەی پێشوو، لا ٥٩٦.

بەرفراوانە لە جیهانی ئیسلامدا[1].

ئەو پرسیارەی لێرەدا سەر هەڵدەدات، بۆچوونی سوننەکان چییە دەربارەی عەلی و ململانێی لەگەڵ معاویەدا؟

سوننەکان ڕووبەڕووی یەکێک لە پڕمشتومڕترین پرسە بیروباوەڕییەکانیان دەبنەوە، کە پێویستی بە بیانووهێنانەوە هەیە لەسەر بنەمایەکی ئایینی. ئەوان ناتوانن ئیدانەی عەلی بکەن، چونکە هیچکەس گومانی لە لەخواترسی و دڵسۆزیی عەلی نییە بۆ ئایینەکەی، لە هەمان کاتیشدا، ناتوانن ئیدانەی معاویە بکەن، چونکە لە ڕاستیدا وەک خەلیفەیەک حوکمی مسوڵمانانی کردووە، گرفتەکە لێرەوە سەر هەڵدەدات[2].

حەسەنی بەصری - کە یەکێکە لە فەقیهە گەورەکان - ڕەخنە لە عەلی دەگرێت لەسەر ئەو بنەمایەی مسوڵمانان لە سەردەمی خیلافەتی ئەودا بۆ یەکەم جار لە مێژووی ئیسلامدا یەکدییان کوشتووە[3]. بەڵام کاتێک بە تەمەندا دەچێت، بۆچوونی لەسەر عەلی دەگۆڕێت و دەڵێت: "خوا لە عەلی خۆش بێت، عەلی تیری خودا بوو بەرەو دوژمنەکانی، پێگەیەکی زانستیی وای هەبوو، کە نزیک بوو لە پێغەمبەری خواوە، ڕەهبانی ئەم نەتەوەیە بوو،ماڵی خودای نەدەدزی، لە فەرمانی خوداش لای نەدەدا، هێز و توانا و کردار و زانستی بە قورئان بەخشی... ئەمە عەلیی کوڕی ئەبی تالیبە[4]."

پێویستە لێرەدا ئەوەش لەیاد نەکەین، حەسەنی بەصری

1 رینولد نیکولسن، *تأريخ الأدب العربي*: ص ١٩١.

2 إبن خلدون، *المقدمة*: ص ٢١٣ و دواتر. ئیبن خەلدوون هەوڵ دەدات گرفتەکە بەپێی تیۆرە دەمارگیرییەکەی خۆی شرۆڤە بکات.

3 الجاحظ، *البيان و التبيين*، المجلد الثاني: ص ٨٨.

4 الجاحظ، *البيان و التبيين*.

لە دوو ساڵی کۆتایی تەمەنیدا رووی کردە زوهد، لەوەشە رووی کردبێتە سۆفیگەری. لە ڕاستیدا سۆفییەکان بە یەکێک لە خۆیانی هەژمار دەکەن[1].

لێرەدا دەگەینە خاڵێک، کە بە شێوەیەکی تایبەتی پەیوەندییەکی بە هێزی بە ناکۆکیی شیعە-سوننەوە هەیە، بە شێوەیەکی گشتییش بە ململانێی ئایدیالی-ڕیالییەوە هەیە. ئەم خاڵە لەم پرسیارەدا خۆی دەبینێتەوە: سۆفیگەری چییە و پەیوەندیی چییە بە گرفتی ئیسلامەوە؟

پرۆفیسۆر براون دەڵێت، سۆفیگەری:

ڕێکخستنێکی غنوسییە[2] بڕوای بە یەکانەیی بوون هەیە، ئایدیالی، خوداییە[3]. زاراوەی سۆفی لە سەدەکانی دواییدا بەسەر ئەو کەسانەدا دابڕا، کە زاهید و لەخواترس بوون، ئەوانەی لە کویکەرزە یەکەمینەکانی بەریتانیا دەچوون، جیاکەرەوەی دیاریان پۆشاکە سادە و ساکارەکەیان بوو، وەک نارازیبوونیان بە لووتبەرزی و فیزی خەڵکی دونیا[4].

بە هەرحاڵ، بە بۆچوونی ئێمە، سۆفیگەری سەرباری شیعەگەری، سیمایەکی ترە لە سیماکانی ئایدیالیزم، کە وەک پەرچەکردارێک دژی ڕەوتی ڕیالیزمی ئیسلامیی تەقلیدی پەرەی سەند. بڕوامان وایە ناکۆکیی نێوان شیعەگەری و

---

١ أحمد أمين، *فجر الإسلام*: ص ١٨٥.

٢ الغنوصية: مەزهەبێکی ئایینیی فەلسەفیی سۆفیگەرییە، لە سەدەی یەکەم و دووەمی زاییندا دەر کەوتووە، ئەم مەزهەبە پێی وایە مەعریفەی ڕاستەقینە، مەعریفەیەکی حەدەسیی سۆزدارییە، کە بەرەو ئاشنابوون بە خودامان دەبات. (و. ک.)

٣ إدوارد ج. براون، *التأريخ الأدبي لبلاد فارس*، المجلد الأول: ص ٤١٦.

٤ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ص ٤١٧.

سۆفیگەری لەو ڕاستییەدا خۆی دەبینێتەوە، کە شیعەگەری پەرچەکردارێکی بەکۆمەڵە، لە کاتێکدا سۆفیگەری پەرچەکردارێکی تاکەکەسییە. واک، کە زانایەکی کۆمەڵناسیی ئایینەکانە، دەڵێت، پەرچەکرداری ئایدیالی، یاخود وەک خۆی ناوی دەبات، ناڕەزاییدەربڕین بەرامبەر مەیلی سەرەکیی پەرەسەندنی دەستەیەکی ئایینی، دوو شێوە بەخۆیەوە دەبینێت: یا ئەوەتا بەکۆمەڵ دەبێت، یان بەتاکەکەسی[1]. بە بۆچوونی ئەو سۆفیگەری یاخود زوهد دەچێتە تەرزی پەرچەکرداری تاکەکەسییەوە[2].

بڕوامان وایە، شیعەگەری زۆر لەوە دەچێت، کە فۆن وایس بە (مەزهەب) و (تایەفە) ناوی دەبات[3]. وایس پێی وایە، "زۆر جار تایەفەکان لە مەزهەبەکان دەچن، لەسەر ئەو بنەمایەی هەردووکیان پەرچەکرداری ئایدیالین، بەڵام لەوەدا لەگەڵ واک کۆکە، کە تایەقە بەشێوەیەکی سەرەکی پەرچەکردارێکی تاکەکەسییە، وایس دەڵێت:

> سەرچاوەکانی تێرکردنی سۆزداریی ڕەفتاری تایەقی، بە شێوەیەکی تەواوەتی لە هەمان کەسدا خۆیان دەبیننەوە، دەشێ بەدبەختیی ئەوانی دیکە و دڵخۆشییان کاری تێ بکات، ئەوە نەبێت چەقی گەردوون لای ئەو (من)ە[4].

دەگەڕێینەوە سەر عەلی و دەبینین هەریەک لە شیعە و سۆفییەکان بەرز دەینرخێنن و ڕەخنەش لە ڕەفتارە

1 جواکیم واک، *سوسیولوجیا الدین*، ص ١٥٠.
2 هەمان سەرچاوە، ص ١٦٣.
3 فۆن وایس-هاورد بیکر، *علم الاجتماع المنهجي*، ص ٢٦٧.
4 هەمان سەرچاوە.

دونیابییەکەی معاویە دەگرن. سوفییەکان ئەو پۆشاکە سوفییانەی دەیپۆشن و جیایان دەکاتەوە، دەگێڕنەوە بۆ عەلی[1] ئەمە ئەو ڕاستییەمان بیر دەخاتەوە، کە شیعە ناوەکەی خۆیان لە عەلییەوە وەر گرتووە، وەک پێشتر باسمان کرد، پێدەچێت ناوی عەلی گوزارشتبێت لە تەواوی ئەو شۆرشانەی دژی پیسکردنی نموونە باڵاکان بەرپا دەکرێن. پێویستە ئەوەش بزانین، وشەی عەلی شێوازی زیدەڕۆییە، بۆ گوزارشتکردن لە شتێک، کە زۆر بڵند بێت. فیلیپ هیتی دەڵێت:

> بزوتنەوەی لاوان (الفتوة) لە سەدەکانی ناوەراستدا پەرەیان بەو ڕێوڕەسم و دروشمانە دا، کە لە نەریتی سوارچاکییەوە وەر گیرابوون. هەروەها بزووتنەوەی دیدەوانیی نوێ، عەلیی کردە ئەو نموونەیەی لە تەواوی جیهانی ئیسلامیدا چاو لە دانایی و نازایەتییەکەی دەکەن. لاوان و دەرویشەکان وەک نموونەیەک هەژماری دەکەن و چاوی لێ دەکەن. هەروەها لایەنگرانیشی بە بێتاوان هەژماری دەکەن، تەنانەت هەندێکیان وەک بەرجەستەکەری خواوەند هەژماری دەکەن. لەوەیە لە ژیانی دونیاییدا تووشی شکست هاتبێت، بەڵام کاریگەرییەکەی دوای مردنی بەردەوام دەبێت، بە پلەیەک، تەنها پێغەمبەر دەتوانێت پێشی بداتەوە[2]

ئیبن خەلدوون، کە نوێنەرایەتیی ڕوانگەی سارانشینی

1. إبن خلدون، *المقدمة*، ص ٤٧٢.
2. فلیب حتي، *تاریخ العرب*، ص ٢.

دەکات، پرسیار لە هۆکاری ئەو پێگە شکۆدارەی عەلی دەکات، لە چاوی مسوڵمانانداو ئەو گومان لە رەوایی بانگەشەی سۆفییەکان دەکات، کە بنەچەی پۆشاکە سۆفیگەرییەکەیان دەگێڕنەوە بۆ عەلی و دەڵێت:

عەلی لەنێو هاوەڵاندا بەوە جیا ناکرێتەوە، کە دەستبەرداری پۆشاکەکانی بووبێت، یان بە جۆرێکی جیاواز پۆشاکی پۆشیبێت، بەڵکوو ئەبوبەکر و عومەر دوای پێغەمبەر، زاهیدترین و خواپەرستترین کەس بوون لەنێو خەڵکیدا. هیچکامێکیان لە ئاییندا شتێکی تایبەتیان نەبووە، بەڵکوو تەواوی هاوەڵان لە ئایینداری و زوهد و جیهاددا یەکسان بوون[1].

پێدەچێت ئیبن خەلدوون چاو لەو راستییە بنووقێنێت، کە سەردەمی عەلی زۆر جیاواز بووە لە سەردەمی هەردوو خەلیفە ئەبوبەکر و عومەر. ژیانی عەلی ژیانێکی زاهیدانە بووە، لە کاتێکدا زۆرینەی ئەو مسوڵمانانەی لەدەوری بوون، لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و بەکاربردنندا نوقم ببوون، بە واتایەکی دیکە، لە سەردەمی عەلیدا گرفتی ئیسلام گەیشتبووە لووتکە.

بە بۆچوونی ئیبن خەلدوون، ململانێی نێوان عەلی و معاویە، تەنها دەستەویەخەبوونێکی کاتیی نێوان دوو مسوڵمانی چاکەخواز بوو، کە لە ئەنجامی هەڵەیەکی ساکاری معاویەوە دژی خەلیفە عەلی سەری هەڵدا. ئەو گریمانەی ئەوە دەکات، ئەو کەسانەی لە هەردوو لایەنەکە کوژراون،

---

١ إبن خلدون، المقدمة: ص ٤٧٢.

لە بەهەشتدان[١]. ئەو خۆی بیئاگا دەکات لەوەی ئەم پرسە ململانێیە، ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزم.

وا دەر دەکەوێت ئەمە خاڵی لاوازی زۆرینەی لێکۆڵەرەوانی ئیسلام بێت، ئەوان تەنها لە یەک لایەنەوە سەیری پرسەکان دەکەن و لایەنەکانی دیکە پشتگوێ دەخەن، لەبەر ئەوە، وێنەیەکی ناتەواوی ئەو دیمەنە دەبینن، کە ڕوو دەدات.

---

١ هەمان سەرچاوە، لا ٢١٢ و دواتر.

# کۆتایی

لە بەشەکانی پێشوودا ئەوەمان ڕوون کردەوە، کە تەواوی ئەو ئایینانەی لە سەرەتای مێژووەوە لە جیهانی شارستانیدا سەریان هەڵداوە، یەک شێوازی هاوبەشیان گرتووەتە بەر، واتا هەموو ئایینێک وەک بزوتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی ڕێگۆڕزەرەکەی دەست پێ کردووە و پاشان وردەوردە بووە بە دامەزراوەیەکی فەرمیی هەماهەنگ لەگەڵ بەرژەوەندییە دونیاییەکاندا، لەبریی ئەوەی لەدژیان ڕاپەڕێت.

ئەوەشمان بینی، کە ئایینی ئیسلام ڕێزپەڕ نەبووە، لە ڕاستیدا ئیسلام بە بەراورد لەگەڵ مەسیحیەت بە نموونە، لە قۆناغێکی زۆر زوودا وەرچەرخاوە و مۆرکێکی دامەزراوەیی وەر گرتووە. دەشێ ئەمە ئەو هۆکارە جەوهەرییە بووبێت، کە وای کرد هەر زوو بزووتنەوەگەلێکی تایەفیی جۆروجۆر لەنێو ئیسلامدا دەر بکەون. لەڕاستیدا بزووتنەوەی تایەفی هەمان ئەو شێوازە دەگرێتە بەر، کە تەواوی ئایینەکان گرتوویانەتە بەر.

دەکرێ لێرەدا پرسیارێکی گرنگ بکرێت: ئەو هۆکارەی لەپشت ئەم دیاردەیەوە وەستاوە، چییە؟ بۆچی لە تەواوی

بزووتنەوە ئایینییەکاندا ڕەوتێک هەیە بۆ ئەوەی سەرەتا وەک بزووتنەوەیەکی شۆڕشگێڕی دەست پێ دەکات و بە بزووتنەوەیەکی کۆنەپارێز کۆتایی بێت – ئەمەش ڕەوتێکی دیالێکتیکییە، دەبێتە هۆی زنجیرەشۆڕشێکی کۆمەڵایەتی یەکلەدواییەک – بەدەستهێنانی چەند ئامانجێک و دواتریش لەدەستدانی وزە و بەردەوامی؟

لەم لێکۆڵینەوەیەدا ویستمان بەبەرفراوانی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە، وەڵامەکەیشمان لەو زاراوەیەدا دۆزییەوە، کە کۆمەڵناسەکان بە (گرفتی کلێسا) ناوی دەبەن، یاخود بە واتایەکی دیکە، ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزم.

**دەتوانین بڵێین، هەموو ئایینێک چەند ئامانجێکی شکۆدار، یاخود نموونەی باڵا بۆ خۆی بوونیاد دەنێت، کە لایەنگرانی هەوڵ بۆ بەدەستهێنانیان دەدەن. وەک هەمیشە شۆڕشی ئایینی وەک شۆڕشێک دژی ستەمی کۆمەڵایەتیی باوی کۆمەڵگە سەر هەڵدەدات، لەبەر ئەوە، بانگەشە بۆ نموونە باڵاکانی دەکات و هەوڵ دەدات قەناعەت بە خەڵکی بکات، کە ئەم نموونە باڵایانە تاکە چارەسەرن بۆ نەخۆشییە کۆمەڵایەتییەکانیان. زۆر جاریش ئەوانەی لە سەرەتادا شوێنی دەکەون، هەژار و چینە نزمەکانی کۆمەڵگەن، چونکە ئەوان بەدەست ستەمی کۆمەڵایەتییەوە ناڵاندوویانە، لەبەر ئەوە، شتێکی سروشتییە ئەگەر ئەوان یەکەم کەس بن باوەش بۆ ئەو بانگەوازە کۆمەڵایەتییە دیموکراسییانە بکەنەوە، کە پێغەمبەران دەیانهێنن.**

وەلێ زۆر جار ئەم هەژار و دڵشکاوانە بۆ ئایین بەس نین و ئایین هەوڵ بۆ ئەوە دەدات. تەواوی چینەکانی

کۆمەڵگە، بە هەژار و دەوڵەمەندەوە، بهێنێتە نێو شانشینە ئایدیالییەکەیەوە. هەوڵ دەدات دەسەڵات پەیدا بکات، چونکە بەبێ دەسەڵات ناتوانێت بە نموونە باڵاکانی بگات. لێرەدا گرفتی ئایین سەر هەڵدەدات، تاکوو ئایین سەرکەوتووتر بێت لە بەدەستهێنانی شوێنکەوتوو و دەسەڵاتدا، زیاتر ئەگەری بەدیهێنانی نموونە باڵاکانی کەمتر دەبێتەوە، هەروەها تاوەکوو ژمارەی شوێنکەوتووەکانیشی زیاتر بێت، ئەو بەرژەوەندییە دونیاییانەی بەهێزتر دەبن، کە هەوڵ بۆ ساختەکردنی ڕۆڵە کۆمەڵایەتییەکەی دەدەن. لەبەر ئەوە، ئایین لەنێوان هێزی ڕاکێشەری دوو ڕەوتی دژ بە یەکدا دەستەپاچە دەوەستێت؛ گەڕان بەدوای دەسەڵاتی کۆمەڵایەتیدا لە لایەک و چارەسەری کۆمەڵایەتی لە لایەکی دیکەوە. نزیکبوونەوەش لە هەرلایەک، لەسەر حیسابی لایەنەکەی دیکە دەبێت، تاوەکوو زیاتریش لە لایەنێک نزیک بکەوێتەوە، زیاتر لە لایەنەکەی دیکە دوور دەکەوێتەوە. لە ڕاستیدا هەردوو سەرەکەی گرفتەکە زۆر تیژن.

ئەگەری ئەوە هەیە لە چەند بارودۆخێکدا، ئایدیالیزم و ڕیالیزم لە یەک سیستەمدا کۆ بینەوە، کە زۆر بە لایەکدا نەڕوات لەسەر لایەنەکەی دیکە. دەکرێ سیستەمەکە لە ناوەندێکی ئاڵتوونیدا (Golden Mean) بوەستێت، (بە گوزارشتێکی ئەرستۆیی) نێوەندگیر بێت، بە جۆرێک، ڕیالیزم بە شێوەیەک لە شێوەکان بەرزتر بکرێتەوە و ئایدیالیزمیش بە ڕادەی پێویست بهێنرێتە خوارەوە.

بەڵام ئەم هەڵوێستە، وەک ئاشکرایە، تەنها هەڵوێستێکی ناسەقامگیر و تێپەڕە، پێدەچێت سروشتی مرۆڤ ڕێگە بەم

(ناوەندە ئالتوونییە) ناوەندگیرییە نەدات. مێژوو پێمان دەڵێت، کۆمەڵگەی مرۆیی وەک پەندوڵ لە لایەکەوە دەچێت بۆ لایەکەی دیکە، لە ڕاستییشدا بە خاڵی ناوەندیدا تێدەپەڕێت و دەشتوانێ بێ ماندووبوون سەقامگیر ببێت، بەڵام یاسای هێز دوورتر لە خاڵی ناوەند پاڵی پێوە دەنێت، تا لەژێر کاریگەریی پێچەوانەدا بێت، پاش کەمێک بەم شێوەیە و تا دوایی.

یاسای دیالێکتیک، وەک ئێدواردز ڕووتی دەکاتەوە، دیاردە جیاوازەکانی گەردوون بەڕێوە دەبات[1]، جا ئەندامی بن یان نائەندامی، لەوانەیە لۆژیکی بزاوت و گۆڕانی گەردوونی بێت. پێدەچێت لۆژیکی ئەرستۆیی تایبەت بە سروشتی جێگیر، لێرەدا و لەژێر ئەم گۆڕانە بەردەوامەدا پووچەڵ بێت، کە هەموو شتێک لە بزوانێکی بەردەوامدایە، هەروەها پێدەچێت گەڕان بەشوێن ڕاستییە جێگیر و بەردەوامەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا، پەیوەندییەکی بە ژیانی ئێمەوە نەبێت، کە لە گۆڕانێکی بەردەوامدایە.

وەلێ زۆرێک لە بیریارانی کۆمەڵایەتی تا ئێستاش لە چوارچێوەی هزرەکانی ئەفلاتوون و ڕاستییە جێگیرەکاندا بیر دەکەنەوە. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سۆسیۆلۆژیای ئیسلام، ژمارەیەکی زۆری ئەو نووسەرانە لە جیهانی ئیسلامیدا بەدی دەکەین، کە خۆیان بە تەرزی بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستەوە سەرقاڵ کردووە و دەبینین بەجیدییەوە هەوڵ دەدەن ئەوەیان بۆ دەر بکەوێت، کە "مریشک لە هێلکەیە، یان هێلکە لە مریشکە." هەردوو مەزهەبەکەی ئیسلام

---

١ ل. ب. أدواردز، التأريخ الثورة الطبيعية، بەشی یەکەم و دواتر.

هەوڵ دەدەن لە ڕێی لۆژیکی ئەرستۆوە بیسەلمێنن ئەوان نوێنەری ڕاستەقینەی حەقیقەتی ڕەهان و مەزهەبەکەی دیکەش جگە لە بیدعە یاخود هەرتەقەیەکی ناعەقڵانی، چیی دیکە نییە.

بەهیوایین توانیبێتمان دەری بخەین حەقیقەتی ڕەها لای هیچکام لەم دوو لایەنە نییە. دەکرێ هەریەکەیان قۆناغێک لە قۆناغە جۆراوجۆرەکانی ئیسلام دەر بخەن، بە واتایەکی دیکە، دەکرێ هەریەکەیان تایبەتمەندییەک لە تایبەتمەندییەکانی ئەو بازنە دیالێکتیکییە دەر بخەن، کە مێژووی ئیسلامی پیدا تێپەڕیوە.

ئیسلامیش وەک تەواوی بزووتنەوە ئایینییەکانی دیکە، وەک ئایینێکی بێگەرد دەستی پێ کردووە، بەشی هەرە زۆری ئەو خەڵکەی ئیسلام لە سەرەتادا بەلای خۆیدا کێشی کردوون، ئەو زەبوون و لاوازانە بوون، کە لە ئیسلامدا مەرهەمێکیان بۆ هەستە بریندارەکانیان بەدی کردووە. ئیسلام بە سیستمێکی سیاسی-ئایینی ناو دەبرێت، تەواوی ئایینەکان لە پەرەسەندنیاندا و لە قۆناغە کۆتاییەکانی گەشەکردنیاندا، بایەخیان بە کاروباری سیاسی و ڕێکخستنی سیاسی داوە، تاکە جیاوازیی نێوان ئیسلام و ئایینەکانی دیکە - ئەگەر هەبێت - لەو ڕاستییەدایە، کە لەیەکدانی ئایین و سیاسەت لە ئیسلامدا لە سەردەمی پێغەمبەردا ڕووی داوە، لەبەر ئەوە دەبینین قورئانیش بەسەر دوو بەشدا دابەش بووە: بەشی یەکەم، مەککەییە، کە ئەوکات پێغەمبەر بە شێوەیەکی بەرچاو بایەخی بە بانگەشەیەکی ئاشتیخوازانە دەدا بۆ ئایین. بەشی دووەم مەدینەییە، کە لای پێغەمبەر بایەخدانی سیاسی پەرەی

سەندووە. پێدەچێت پرۆفیسۆر براون ئەم کۆکردنەوەی ئایین و سیاسەتەی لە ئیسلامدا پێ باشتر بێت لەو ئایینە رووتەی لە مەسیحییەتدا هەیە. لە روانگەی ئەوەوە، نموونە بالاکانی ئیسلام، لەوانەی مەسیحییەت نزمترن، بەلام سەرباری ئەوەش بە بەراورد بە نموونە بالاکانی مەسیحییەت، کردەییترن و شایانی پراکتیزەکردنن[1].

وەلێ ئەم (ناوەندە ئالتوونییە) یاخود لەیەکدانە کردەییەی ئایدیالیزم و ریالیزم، هەر زوو لە مێژووی ئیسلامدا رووی داوە، بەدلنیاییەوە بە هۆی فشارە لادەرەکانی گۆرانی کاتەوە ناکرێ بەردەوام ببێت.

لە بەشەکانی پێشوودا تێبینی ئەوەمان کرد، ئەم ناوەندە ئالتوونییە [نیوەندگیرییە] چەند سالێکی کەم دوای مردنی پێغەمبەر بەردەوام بووە، زۆری نەبرد کوشتارگەی ولاتی فارس و کەوانەی بەپیت لە جەرگەی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامیدا روویان دا و پەندولەکەش رووەو لای (راست) ملی نا. مەیلی پەرگیرانە بەرەو چەپ دوور کەوتەوە و دیالیکتیک بە ئاراستەی پێچەوانە کەوتە کار و دەرکەوتنی بزووتنەوەیەکی کۆمەلایەتیی نوێ، چاوەروانکراو بوو.

دەتوانین بەراوردێکی واقیعی بکەین لەنێوان شۆرشی پرۆتستانت، کە دژی پاپاگەریی دونیایی سەری هەلدا، لەگەل رەتکردنەوەی شیعەدا، کە دژی خەلیفە خۆشگوزەرانەکان سەری هەلدا. پاپاگەری سەرکەوتنی کلیسا و دامەزراندنی شانشینە دونیاییەکەیەتی، هەروەها لە هەمان کاتدا ئاماژەیە بۆ پاشەکشەی ئەو ئایینە بێگەردەی مەسیح هێناویەتی.

---

١ ي. براون، *تاريخ الأدب الفارسي*، المجلد الأول: ص ١٨٨.

هەمان شت بۆ خیلافەت لە ئایینی ئیسلامدا راستە، کە سەر دەکەوێت و ئیمپراتۆریەتێکی مەزن دادەمەزرێنێت، لە هەمان کاتدا ئاماژەشە بۆ دوورکەوتنەوەی لە نموونە باڵا زوهدییەکانی محەمەد هێنابوونی. محەمەد بەردی لە سکی دەبەست تا ئازاری برسێتییەکەی سووک ببێت، لە کاتێکدا دەبینین خەلیفە (موتەوەککیل)ی عەباسی لە کۆشکەکەیدا (٤٠٠٠) کەنیزەکی هەبووە[1]. لێرەدا شتێکی دیکە سەربار دەکەین و وای دەبینین مسوڵمانە تەقلیدییەکان ئەم خەلیفەیە - کە بە (نیرۆنی خۆرهەڵات)[2] ناو دەبرێت[3] - بە زیندووکەرەوەی سوننە هەژمار دەکەن، چونکە زۆر دژدانە بیدعەکانی لەناو بوو. ئەحمەد ئەمین دەڵێت:

> سەربارى ئەو راستییەی یەکێک بووە لە ستەمکارترین خەلیفەکان، بەڵام سوننەکان بەرێزەوە لێی دەڕوانن و چاوپۆشییش لە کردارە ناشیرینەکانی دەکەن... زۆرێک لە سوننە نوێکان لە کردەوە خراپەکانی خۆش بوون، دوای ئەوەی چەند خەونێکیان پێوە بینیوە، کە خودا لێی خۆش بووە[4].

لە راستیدا ئەو دامەزراوە کەموێنەیەی خیلافەت، دەبوو

1 فلیب حتي، *تاريخ العرب*، ص ٣٤٢.

2 نیرۆن: پێنجەم و کۆتا ئیمپراتۆری ئیمپراتۆریەتی رۆمانی بووە، ساڵی ٥٤-٦٨ زایینی فەرمانڕەوایەتیی کردووە. کەسێکی زۆردار و چەوسێنەر بووە بەتایبەتی دژی مەسیحییەکان و لەسەر دەستی ئەویش دوو کۆڵەکەی کلیسای مەسیحی لەناو براون: قەشە بترس و قەشە پۆلس. (و. ک.)

3 درویش مقدادي، *تاريخ الأمة العربية*: ص ٣٢٠.

4 أحمد أمين، *ظهر الإسلام*، المجلد الأول: ص ١٩٨.

تیایدا ئایدیالی و ریالیزم کۆ ببنەوە، لە روانگەی تەواوی لێکۆلەرەوانی ئیسلامەوە، فاکتەری سەرەکییە لەپشت سەرهەڵدانی مەزهەبە جۆربەجۆرەکانی ئیسلامەوە[1].

بە شێوەیەکی گشتی ئەم لێکۆڵینەوەیە باس لە دابەشبوونی سوننە-شیعە دەکات، لەسەر ئەو بنەمایەی بەروونی گرفتی ئیسلام دەر دەخات، دەشکرێت بەو ناکۆکییە مەزهەبییە سەرەکییە هەژمار بکرێت، کە تەواوی مەزهەبەکانی دیکەی ئیسلام، بە شێوەیەک لە شێوەکان، بەشدارییان تێدا کردووە.

ئیسلام رووبەرووی چەندین پرسی خیلافەتی مەزهەبی یەکلەدواییەک بووە، بەتایبەت لە سەردەمانێکی زۆر زووی مێژووەکەیدا، کاتێک خیلافەت گەیشتبووە ترووپک. ئەوەی جێی سەرسامییە، ئەوەیە تەواوی ئەو پرسانە کۆتاییان هات و نەمان، تەنها یەکێکیان نەبێت، ئەویش ناکۆکیی سوننە و شیعەیە. پێدەچێت شوێنێکی هەمیشەیی، یان روونتر بڵێین، ئەرکێکی کۆمەڵایەتیی دیکە بوونی نەبێت بۆ پرسەکانی دیکەی خیلافەت. هەروەها لەپێناو ئەو ململانێ قورسەی لەنێوان ئایدیالی و ریالیزمدا هەیە، هەر دەبێ دوو گروپ بوونیان هەبێت، بە بۆچوونی ئێمە، یەکێکیان ریالیستییە، کە پالپشتی لە خیلافەت دەکات، لە کاتێکدا ئەوی دیکەیان ئایدیالییە، کە دژی خیلافەتە. ئەو مەزهەبانەی لێرە و لەوێ بە هەر هۆیەکەوە سەریان هەڵداوە، هەر دەبوو یا بدەنە پاڵ یەکێک لەم دوو لایەنە سەرەکییە، یا لەناو بچن، هەر وەک دەر دەکەوێت هەر ئەمەش لە مێژووی مەزهەبیی ئیسلامدا رووی داوە.

---

[1] أحمد أمين، فجر الإسلام، ص ٢٥٤ و دواتر.

لە ڕاستیدا ئەمە بە مانای ئەوە نایەت، کە سوننە بەتەواوی مانای وشەکە واقیعین، یاخود شیعە ئایدیالین. ڕاستە ئەگەر بڵێین لە بواری کۆمەڵایەتیدا دیاردەیەکی ڕووت بە شێوەیەکی ڕەها بوونی نییە، بەڵکوو مەیلگەلی دیاریکراو هەن ڕووەو ئەم شتە یان شتێکی دیکە. بەهیوایین توانیبێتمان بەڕوونی تەواوی مەیلە جیاکەرەوەکانی هەردوو لایەنەکە دەر بخەین - پرسی خیلافەت ئەو مەیلانەمان بۆ دەر دەخات، کە بە کرۆکی ناکۆکیی مەزهەبی لە ئیسلامدا هەژمار دەکرێن. سوننەکان پێیان وایە هەرکەسێک بگاتە دەسەڵات - جا مافی خۆی بێت یان نا - خەلیفەیەکی شەرعییە، لە کاتێکدا شیعە لە تایبەتمەندییەکانی خەلیفەدا توندترن، تەنانەت پەرەشیان بە چەمکی بێتاوانی و پیرۆزی داوە، بێ ئەوەی گوێ بەوە بدەن، تاچەند دەکرێ ئەم بیروباوەڕە ئایدیالییانە بە شێوەیەکی کردەیی پراکتیزە بکرێن.

بە هەرحاڵ، پێویستە ئەوە لەبیر نەکەین ئەم ناکۆکییە لە مەیلەکاندا، کە شیعە لە سوننە جیا دەکەنەوە، پرسێکی مێژووییە. واتا دەگەڕێتەوە بۆ ڕابردوو. دەکرێ مرۆ لە ئێستادا لایەنە لەیەکچووەکانی نێوان سوننە و شیعە زیاتر ببینێت وەک لە ناکۆکییەکان، واتە دەتوانین تەرزێکی هەڵوێستی ماددی تێبینی بکەین، کە چوونەتە نێو بیروباوەڕی شیعەوە، لەبەرامبەریشدا چەند تەرزێکی هەڵوێستی ئایدیالی دەبینین، کە دزەیان کردۆتە نێو بیروباوەڕی سوننەوە.

بڕوامان وایە بە تێپەڕبوونی کات و بە گرتنەدەستی دەسەڵات لێرەولەوێ، سروشتییە ئەگەر پێشبینیی ئەوە بکەین، شیعەکان وردەوردە کەمتر ئایدیالی بن، بەمەش

دەکەونە نێو کاروبارە کۆمەلایەتی و بەرژەوەندییە دونیاییەکانەوە. دینامیکیەتی کۆمەلایەتی ڕێگە نادات شیعەکان بۆ ماوەیەکی درێژ وەک خۆیان بمێننەوە. سەرنجی ئەوەمان داوە، (باقر مەجلیسی) ئەو فەقیهە گەورەیەی لە سەردەمی سەفەوییەکاندا لە بلاوکردنەوەی شیعەگەری لە ولاتی فارسدا ڕۆلێکی گەورەی گێڕاوە، چەند مەیلێکی نیشان داوە ڕووەو بیرکردنەوەی واقیعی، کە پێشتر زۆر بەدەگمەن دەمانبینی[1]. پێدەچێت قەناعەتی بە بیرکردنەوەی ئایدیالیی ڕووت نەبێت، کە لە ڕابردوودا شیعەگەریی پێ جودا دەکرایەوە. لە سەردەمی ئەودا شیعەگەری وەک جاران شۆڕشی لاوازەکان نییە، بەلکوو دامەزراوەیەکی ئایینیی سەرکەوتووی خاوەن جۆرێک لە ئەزموونی کردەییە، بۆ نموونە، کاتێک مەجلیسی قسەی لەسەر پێگەی خوداییی پێشەوا دەکرد، هەولی دەدا گفتوگۆ ئایدیالییەکەی لەگەل ڕەگەزێکی بەهێزی ڕوونکردنەوەی کۆمەلایەتیی واقیعیدا تێکەل بکات. مەجلیسی دەیوت: ئەگەر پادشایەک والی یەکێک لە شارەکان لاببات و کەسی دیکەش نەخاتە جێگەکەی، یاخود یەکێک لە سەرۆکخێلەکان واز لە گوندەکەی بهێنێت و لێگەڕێ خەلکەکە خۆیان کاروبارەکانی خۆیان بەو شێوەیەی دەیخوازن، ڕایی بکەن، ئەوا کارێکی دانایانە نییە. کەواتە چۆن دانایی لەوەدا بەدی دەکەین، کە خودا یاخود پێغەمبەرەکەی خەلکی جێ بهێلن بێ ئەوەی دوای پێغەمبەر پێشەوایەکیان بۆ دیاری بکەن[2].

---

١ دوایت دونالدسون، //عقیدە الشیعة//: ص ٣١١ و دواتر.
٢ هەمان سەرچاوە: ص ٣١٢.

سەبارەت بە سوننەش، لێکۆڵەرەوانی ئیسلام هاوڕان لەسەر ئەوەی بە هۆی کاریگەریی بزووتنەوەی سۆفیگەرییەوە چەند تایبەتمەندییەکی ئایدیالی دزەیان کردۆتە نێو بیروباوەڕەکەیانەوە.

پێشتر بینیمان بزووتنەوەی سۆفیگەری لە ڕووی مەیلە ئایدیالییەکانییەوە لە شیعە دەچێت، هەر وەک سەرنجیشمان دا، ناکۆکیی سەرەکیی نێوان ئەم دوو بزووتنەوە ئایدیالییە لەو ڕاستییەدایە، کە سۆفیگەری نارەزایەتییەکی تاکەکەسییە، لە کاتێکدا شیعەگەری نارەزایەتییەکی بەکۆمەڵە، یاخود کۆمەڵایەتییە. دەکرێ ئەمە ئەو هۆکارەمان بۆ ڕوون بکاتەوە، کە سوننەکان سۆفیگەری وەک بزووتنەوەیەکی مەترسیدار هەژمار ناکەن لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی، یاخود بە خاوەن بیدعەیان نازانن.

بە هەرحاڵ، سوننەکان لەژێر کاریگەریی سۆفیگەریدا، دەستیان کرد بە نارەزاییدەربڕین لەهەمبەر دونیابوونی خەلیفەکانیان. سەرباری ئەوەی ئەمەیان بە شێوەیەکی ئاشتییانە و لەسەرخۆ کردووە، ئەوانیش وەک شیعەکان لە چاوەڕوانیی ڕزگارکەری خودایی (مەهدی)دان کە "لە کۆتاییی دونیادا دەر دەکەوێت، تاکوو دونیا پڕ بکات لە یەکسانی و دادپەروەری، دوای ئەوەی پڕ بووە لە ستەم و زۆرداری[1]." هەنووکە گۆڕی هەندێک لە شێخە سۆفییەکان لای سوننەکان بوونەتە مەزارگە و سەردانیان دەکەن و ڕێوڕەسمی ئایینیی تێدا ئەنجام دەدەن و قوربانییشی تێدا دەکەن، ئەم دیاردەیەش لەوە دەچێت کە لای شیعەکان هەیە سەبارەت

١. د. ب. مکدونالد، بند (المهدي)، موسوعة الإسلام، المجلد الثالث: ص ١١٤.

بە پێشەواکانیان، بەوەی بە نموونەی باڵای شۆڕشەکانیان هەژماریان دەکەن.

پێویستە لێرەدا ئەوە بیر بخەینەوە، کە بیرۆکەی (مەهدی) ڕاستەوخۆ دوای دارمانی خیلافەت هاتوتە نێو بیروباوەڕی سوننەوە. ماکدۆناڵد دەڵێت:

ئەوان لە ناوەندی تاریکی و نەبوونی پەقینی - ئایینی و کۆمەڵایەتی و ئاکاری و عیرفانیدان - هەر بۆیە پەنایان بۆ ڕزگارکەری کۆتایی دونیا بردووە[1].

کەواتە دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی لە کۆتاییدا سوننەکان کەوتوونەتە دۆخێکەوە، زۆر لەو دۆخە دەچێت، کە بەر لە چەند سەدەیەک بووە هۆی دەرکەوتنی شیعەگەری. سوننەکان کە پێشتر لە چینە دەوڵەمەندەکانی ئیمپراتۆریەتی ئیسلامی بوون، ئێستا دەچەوسێنرێنەوە و خراپ مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێت، وەک پێشتر بەسەر برا شیعەکانیاندا هات. وەک بینیمان، ڕیالیستی ڕەفتاری چینە فەرمانڕەوا گەشبینەکانە، بەڵام هەر کە ستەمیان لێ کرا، ڕەفتاری ڕیالیستییان نامێنێت و دەچنە خەوەبینداری و تەرزێکی بیرکردنەوەی ئایدیالییەوە.

سوننەکان ئاوهایی بوون. زۆری نەبرد، دەسەڵاتی سیاسیی ئیسلام لاواز بوو و بەمەش سوننەکان لە بەرزی هاتنە خوارەوە تاکوو گەیشتنە ئەوەی چاوەڕێی ڕزگارکەری خودایی بکەن، کە سەرکەوتنە کۆنەکەیان و نموونە باڵاکانی ئیسلامیان بۆ دەگێڕێتەوە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەم پەرەسەندنە لە بیروباوەڕی هەریەک

1. هەمان سەرچاوە: ص ١١٢.

لە سوننە و شیعەدا، دەتوانین بگەینە ئەو دەرئەنجامەی دابەشبوونی سوننە-شیعە، هەنووکە گرفتی ئیسلام نییە، لەوەدا کە تایبەتە بە ئایدیالیزم و ریالیزمەوە. بەڕای ئێمە، ئەم دەرئەنجامە تا ڕادەیەک دەرئەنجامێکی ڕاستە، بەڵام نابێت ئەوەش لەیاد بکەین، مەیلە تەقلیدییەکانی ئەم دوو دەستەیە ناکرێ بە شێوەیەکی تەواوەتی لەناو بچن، بەڵکوو بە هۆی هەڵوێستە دژەکانیانەوە لە ڕابردوودا، هەر دەبێ شوێنەوارێک دوای خۆیان جێ بهێڵن. هەمیشە ڕووداوە مێژووییەکان جۆرێک لە شوێنەوار لە زیهنی خەڵکیدا – بە شێوەیەکی خودئاگایانە یان ناخودئاگایانە – بۆ ماوەیەکی دووروودرێژ دوای ڕوودانیان جێ دەهێڵن، بەتایبەت کاتێک خەڵکی کۆنەپارێز بن، واتا ڕێز لە ڕابردوویان بگرن.

باسی ئەوەشمان کرد، چەند شوێنەوارێکی ڕیالیستی تا هەنووکە بە مەزهەبی سوننەوە دیارن، سەبارەت بە مەیلە نوێکە ڕووەو ئایدیالیزم. لەوەیە سەیر بێت، گەر ببینین زۆرینەی ئەو کەسانەی بە ناوی مەهدییەوە لەم چەند سەدەیەی ڕابردوودا لە جیهانی ئیسلامیدا دەر کەوتوون، سوننە بوون نەک شیعە. ڕاستییەکی جێگیرە، کە شیعەکان بڕوایان بە مەهدی لە سوننەکان پتەوتر و بەهێزترە، بەڵام تا ئێستا هیچ مەهدییەکی شیعە دەر نەکەوتووە تەنها یەک کەس نەبێت، کە ئەویش (باب)ـە و لە سەدەی ڕابردوودا لە وڵاتی فارس دەر کەوتووە و بزووتنەوەی بەهائیی دامەزراندووە.

ئەو هۆکارەی لەپشت ئەم دیاردە نامۆیەوە وەستاوە – بە بۆچوونی ئێمە – ئەوەیە، بۆچوونی سوننەکان دەربارەی مەهدی واقیعیترە لە بۆچوونی شیعەکان. شیعەکان بڕوایان

وایە پێشەوای دوانزدەیەمیان (مەهدی) کە ساڵی ٢٥٥ی کۆچی لەدایک بووە، تا هەنووکە زیندووە و تەنها لە شوێنێکی ئەم جیهانە خۆی شاردۆتەوە بە ناوی (دوورگەی سەوز)، لەوێ چاوەڕوانی فەرمانی خوداییە تا لە داهاتوودا ڕۆژێک لە ڕۆژان دەر بکەوێت و باوەڕداران ڕزگار بکات. ئەو بە پەرجوویەکی خودایی زیندووە و دەر دەکەوێت و بە ویستی خودا شکست بە دوژمنە مێژووییەکانی دەهێنێت[1].

وەلی مەهدی سوننەکان پیاوێکی ئاساییە، وەک هەر پیاوێکی دیکە لەدایک دەبێت و گەورە دەبێت، لە ساتی گونجاودا دژی دونیایی خەڵکی هەڵدەستێت و دەنگی بەرز دەکاتەوە، دواتر بە ویستی خودا ڕێز و شکۆ بۆ ئیسلام دەگێڕێتەوە.

سوننە زۆرێک لەوانەی بەرهەم هێناوە، کە بانگەشەی مەهدیبوون دەکەن، بە هۆی ئەوەی کەوتوونەتە ژێر ئەم تەرزەی بیرکردنەوەی واقیعییەوە دەربارەی ئەو ڕزگارکەرەی لە کۆتایی دونیادا دێت. بەرئەنجامەکەشی، وەک مامۆستا ئەحمەد ئەمین دەیبینێت، چەواشەکردنی جەماوەر و هەڵگیرساندنی شۆڕشی یەکەدوایەکە لە مێژووی ئیسلامدا[2].

ئەحمەد ئەمین دادوبێدادیەتی لەدەست ئەم هزرە (ناڕاژدەرە) لە چاوەڕوانیی (مەهدی)، لۆمەی شیعەکان دەکات بەوەی ئەوان دایان هێناوە. پێی وایە بیروباوەڕێکی خورافییە و پێچەوانەی سیستمی سروشتییە و لەگەڵ بیرکردنەوەی

---

١ دوایت دونالدسون: موسوعة الإسلام، الجزء الحادي عشر

٢ أحمد أمين: ضحى الإسلام، المجلد الثالث: ص ٢٤٤

دروستدا ناگونجێت[1]. بە بۆچوونی ئێمە، مامۆستا ئەحمەد ئەمین تا هەنووکە لە ڕوانگەیەکی دیالێکتیکیی وەستاوەوە لە کاروبارە کۆمەڵایەتییەکان دەڕوانێت، کە بیرکردنەوەی سەدەکانی ناوەڕاستی پێ جودا دەکرێتەوە، پێدەچێت ئەو نەتوانێت درک بەوە بکات، کە ناتوانرێت هەمیشە بیرکردنەوەی عەقڵانی و تێرامانە ئاسوودەکان بەسەر دینامیکییەتی کۆمەڵایەتیدا پراکتیزە بکرێت.

بە بۆچوونی ئێمە، بیروباوەڕی مەهدی لە ئیسلامدا - چا لای شیعە بێت یان سوننە - لە ئەمڕۆدا ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ڕیالیزمە. بە تێپەڕبوونی کاتیش، نزیکبوونەوە لە نموونە باڵاکانی پێغەمبەر ئەستەم و ئەستەمتر دەبێت، بێگومان ئەم هەڵوێستەش دەبێتە بارگرانییەکی قورس بەسەر ویژدانی مسوڵمانە باوەڕدارەکانەوە. سۆفییەکان - وەک ڕاهیبەکان - پەنا دەبەنە بەر ڕێگە کەسییەکانیان بۆ ئەوەی دڵسۆزی دەستبخەن، وەلێ تەواوی مسوڵمانانی دیکە، کە لە پێغەمبەرەکەیانەوە فێری ئەوە بوون بە شێوەیەکی بەکۆمەڵ مامەڵە لەگەڵ ژیاندا بکەن و بە جیاوکگەلی کەسی ڕازی نەبن، ئەوان بەردەوام پێشبینیی شۆڕشێکی کۆمەڵایەتی و ڕزگارکەرێکی بەکۆمەڵ دەکەن، لەبەر ئەوە، بیروباوەڕی مەهدی وەڵامێکی گونجاوە بۆیان، بەڵام گرفتەکە هەر بوونی هەیە، ئەو کاتە بوونی نامێنێت کە کۆمەڵگە لە جووڵە دەوەستێن، بەدڵنیاییەوە ئەمەش لە کۆتاییی دونیادا دەبێت.

---

١ هەمان سەرچاوە: ص ٢٤٤-٢٤٥.

## سەرچاوەکان

### کتێبە عەرەبییەکان:


- أحمد أمين، *ضحى الإسلام*، الجزء الثالث، القاهرة لجنة التأليف ١٩٣٨-١٩٤٣.

- أحمد أمين، *ظهر الإسلام*، القاهرة لجنة التأليف ١٩٤٥.

- أحمد أمين، *فجر الإسلام*، القاهرة لجنة التأليف ١٩٤٥.

- أبو يوسف يعقوب، *كتاب الخراج*، القاهرة، مطبعة السلفية، ١٣٤٧ هجري.

- أمين فارس الريحاني، *تاريخ نجد الحديث*، بيروت، دار صادر، ١٩٢٨.

- الجاحظ، *البيان و التبيين*، الجزء الثالث، مطبعة مصطفى محمد، ١٩٣٢.

- جورجي زيدان، *تاريخ التمدن الإسلامي*، الجزء الخامس، القاهرة، دار الهلال، ١٩٠٢.

- حسين البراقي، *تاريخ الكوفة*، مطبعة الحيدرية، ١٣٥٦.

- درويش عبدالقادر المقدادي، *تاريخ الأمة العربية*، الطبعة

الثانية، دار المعارف، بغداد ١٩٣٢.

- دولاند داويت، *عقيدة الشيعة*، مطبعة السعادة، القاهرة ١٩٣٣.

- دي بورية، *تاريخ الفلسفة في الإسلام*، لجنة التأليف، القاهرة ١٩٣٨.

- عبدالرحمن بن خلدون، *المقدمة*، مطبعة مصطفى محمد، القاهرة.

- *كتاب العبر*، بولاق، القاهرة ١٢٨٤ هجري.

- عبدالكريم الشهرستاني، *الملل و النحل*، ايران ١٢٨٨ هجري.

- عبدالقادر المغربي، *الأخلاق و الواجبات*، مطبعة السلفية، القاهرة ١٣٤٧ هجري.

- عبدالله السبيتي، *أبو ذر*، مطبعة السعادة، طهران.

- عبدالله العلايلي، *تاريخ الحسين*، مطبعة العرفان، بيروت.

- محمد حسين الزين، *الشيعة في التأريخ*، مطبعة العرفان، صيدا ١٩٣٨.

- محمود عباس العقاد، *عبقرية الإمام*، مطبعة المعارف، القاهرة.

- أبو الشهداء، *نهج البلاغة*، المجلد الثالث، مطبعة الإستقامة، القاهرة.

- محمد مهدي الكاظمي، *خصائص الشيعة*، مطبعة دار السلام، بغداد ١٣٤١ هجري.

## کتێبە ئینگلیزییەکان:


- Aghnides, Nicolas P., *Mohammedan Teories of Finance* New York: Columbia University, 1916.

- Ali, Seyed Ameer, *The Spirit of Islam, London,* W. H. Allen & Company Ltd., 1851.

- Arnold, Sir Thomas, W. *The Caliphate,* Oxford, At the Clarendon Press, 1924.

- Brinton, C. Crane, *The Anatomy of Revolution,* New York, W. W. Mortan & Company 1938,

- Browne, Edward G., *A Literary History of Persis,* 2 Vols, New York, Charles Scribner & Sons, 1902-1906.

- Dawson, Carl and Gettysm Warner, *An Introduction To Sociology,* Rev. Ed. New York, The Ronald Press Company, 1945,

- DeGre, Gerard L., *Society and Idology,* An Inquiry into the Sociology of Knowledge, New York, Columbia University Bookstore, 1943,

- Durant, Will, *The Story of Philisophy,* New York, Garden City Publishing Company, 1943,

- Edwards, Lyford P., *Natural History of Revolution,* Chicago, the University of Chicago Press, 1927.

- Finkelstein, Louis, *The Pharisees, the Sociological Background of their Fath,* Philadelphia, Jewish Publication

Society of American. 1938.
- Gilman, Arthur, *The Story of the Saracens,* New York, The Story of Nations, 1891.
- Gown, Herbert H., *A History of Religion,* Milwaukee, The Morehouse Pubishing Company, 1934.
- Great Britain, *Review of the civic Adminstration of Mesopotamia,* London, H. M. Stationery Office, 1920.
- Hitti, Philip K., *History of the Arabs,* 3rd Ed., Revised, London, Machmillan Company, 1946.
- Jamali, Mohammed Fadhil, *The New Iraq: Its Problem of Bedouin Education,* New York, Teachers College, Columbia University, 1934.
- Khadduri, Majid, *The Law Of War Peace in Islam,* London, Suzac & Company, 1940.
- Kincheloe, Samuel Clarence, *The Prophet, A Study In the Sociology of Leadership,* University of Chicago, Ph. D. dissertation, March 1929.
- Lane-Poole, Stanley, *The Speeches and Table-Talk of the Prophet Mohammad,* London, Macmillan & Company, Ltd., 1905.
- Levy, Reuben, *An Introduction to the Sociology of Islam,* 2 Vols, London, Williams and Norgate, Ltd., 1931-1933.
- Louks, William N. and Hoot, J. Weldon, *Comparative Economic Systems,* New York, Haroer & Brothers, 1943.
- Magoffin, Ralph V. D. and Duncalf, Frederic, *Ancient*

*and Medieval History*, New York, Silver, Burdett and Company, 1934.

- Main, Ernest, *Iraq From Mandate to Independence*, London, George Allen & Unwin, Ltd., 1935.

- Mannheim, Karl, *Idealogy and Utopia*, New York, Harcourt, Brace Company, 1936.

- Mass, H., *Islam*, New York, G. P. Putmans Sons, 1938.

- Mathews, Shailer and Smith, Gerald Birney, *A Dictionary of Religion And Ethics*, New York, The Macmillan Company, 1921.

- Nicholson, Reynold A., *A Literary History of the Arabs*, Cambridge University Press, 1930.

- Niebuhr, Reinhold, *Christainity and Power Politics*, New York, Charles Scribners Sons, 1940.

- ..............., *Moral Man And Immoral Society*, New York, Charles Scribners Sons, 1932.

- Nibuhr, H. Richard, *The Social Sources of Denominationacism*, New York, Henry Holt and Company, 1929.

- Nietzceheche, Friedrich, *The Philosophy of Nietzcehechem*, New York, The Modern Library.

- Smith, W. Robertson, *Kinship and Marriage in Early Arabia*, London, Adam and Charles Black, 1903.

- ..............., *Lectures on the Religion of the Semites*, 3rd Ed., New York, The Macmillan Company, 1927.

- Syles, Sir Percy, *A History of Persia*, 2 Vols, 2nd Ed., London, Macmillan and Company, 1921.
- Titus, Harold H., *Living Issues in Philosophy*, New York, American Book Company, 1946.
- Toynbee, Arnold J., *Astudy of History*, (Abridgment by D. C. Somervell), New York & London, Oxford University Press, 1947.
- ..............., *A Study of History*, 6 Vols, London, Oxford University Press, 1939.
- Veblen, Thorstein, *The Theory of the Leisure Class*, New York, The Modern Library, 1934.
- Wach, Joachim, *Sociology of Religion*, Chicago, the University of Chicago Press, 1944.
- Weber, Max, *The Protestant Ethic and the Spirit of Capitalism*, George Allen & Unwin, Ltd., 1930.
- Wells, H. G., *The Outline of History*, (New & Revised) New York, Garden City Publishing Company, 1932.
- Wiese, Leopold von and Howard Becker, *Systematic Sociology*, New York, John Wiley and Sons, 1932.
- Yinger, J. Milton, *Religion in the Struggle for Power*, Durham, N. C., Duke University Press, 1946.

***

- *The Catholic Encyclopedia*, Edited by Herbermann, Charles G.m et al, 1st Vol, New York, Robest Appleton Company, 1907.

- *Encyclopedia of the Social Sciences*, Edited by Hastings, James, et al, New York, The Macmillan Company, 1930-1935.
- *The Encyclopedia of Islam*, Edited by Houtsman, M. T., et al, 4 Vols, London, Luzac & Company, 1913-1934.
- *The Koran*, Translated by Palmer, E. H. Oxford, Oxford University Press, 1947.

# ئیندێکسی ناوەکان

- ئ -

ئیندێکس

- ع -

- ل -



- م -

# ئیندێکسی وڵاتان و شوێنەکان

- ئ -



- ب -

- پ -



- ت -



- ح -



- د -



- ز -



- س -

- ش -



- ع -



- ف -



- ک -



- ل -



- م -

# ئیندێکسی گەلان

- ڕ -



- ز -



- س -



- ش -

- ع -



- ف -



- ق -



- م -



- ن -

ئەم لێکۆڵینەوەیە، هەوڵ دەدات لە چەند تیۆرییەکی کۆمەڵایەتیی ئیسلام بکۆڵێتەوە، نەک وەک هزرگەلێکی لۆژیکی، کە لە فەراغدا بوونیان هەیە، بەڵکوو وەک ئایدیۆلۆژیاگەلێک، کە لە کارلێکی بەردەوامدان لەگەڵ ئەو بارودۆخە کۆمەڵایەتییانەی تیایاندا دەر دەکەون. ململانێی نێوان ئایدیالیزم و ریالیزم، لە تەواوی قۆناغەکانی کۆمەڵگەی مرۆییدا بوونی هەبووە، زیدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین، ئەم ململانێیە بە شێوەیەکی توند لە مێژووی ئیسلامدا خۆی دەر خستووە. لەم لێکۆڵینەوەیەدا، هەوڵ دراوە هۆکارەکان و پەرەسەندنی ئەم لایەنە جیاوازەی ئیسلام بخرێتە ڕوو.




٦٠٠٠ دینار